# پێرست

# پێشەکی

جیاوازی چیە لە نێوان کەسی سەرکەوتوو و شکست خواردوو؟ ئەو سیحرە چیە کە کەسانی سەرکەوتوو بەکاری دەهێنن؟
بۆچی لە کاتێکدا حەزمان بە سەرکەوتنە ، بەڵام سەرکەوتوو نابین؟!
ئەی نالێین گەر حەزت بەکردنی کارێك کرد ، سەرکەوتوو دەبیت تیایدا؟!
ئەی نهێنی سەرکەوتن چیە؟ کردنی چ کارێك بەرەو سەرکەوتنمان دەبات؟ کەسانی سەرکەوتوو چۆنن؟ بیرکردنەوەیان چۆنە؟ چۆن سەیری شکست دەکەن؟ ....

ئەم کتێبە باسێکی کەسانی سەرکەوتوو و ئەو نهێنیانەی کە بونەتەی هۆی سەرکەوتنیان دەکات، باسی تواناکانی هەرکەسێك دەکات کە چەندە ناوازەیە، باسی ناوازەیی ناخی هەر تاکێك دەکات ، پاشانیش بە زمانێکی سادە نوسراوە بۆ ئەوەی خوێنەر بەئاسانی لێی تێبگات.

چەند هۆکارێك هەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ سەرکەوتوو نەبێت کە ئەمانەن

* خەڵکی ناتوانن بگەن بە سەرکەوتن
* یان نایانەوێت سەرکەوتوو بن
* یا نازانن چۆن بگەن بە سەرکەوتن
* یان ناوێرن سەرکەوتوو بن !

لەم کتێبەدا هەوڵدراوە چارەسەرێك بۆ ئەم پرسانە بخاتەروو ئەڵبەتە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی و بە بێ ڕیزبەندی و دیاریکردن ، واتە هەر چوار هۆکارەکە و چارەسەر بەتێکەڵی لە کتێبەکەدا خراونەڕوو..

بەهیوای ئەوەی ئەم کتێبە ببێتە هۆکار بۆ "گۆڕینی" ڕێڕەوی ژیانی کەسانێك بەتایبەتی ئەو جۆرەکەسانەی کە "بڕیاریان" داوە بگۆڕێن!

## نهێنی کەسانی سەرکەوتوو چیە ؟

چەندین کەسی ئاسایی و سادە و تەنانەت نەخوێندەوارم بینی، کە بە شێوەیەکی زۆر گەورە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا!
وە چەندین کەسی زیرەك و بەتوانا و خاوەن پسپۆڕیم بینی ، کە بە شێوەیەکی زۆر خراپ توشی شکست بوون!
کەواتە نهێنی سەرکەوتن ، زیرەکی و بونی پسپۆڕی نیە!

چەندین کەسم بینی کە بە کاتێکی کەم کارەکانیان بەڕێوەدەبرد و سەرکەوتنێکی چاوەڕوان نەکراویان بەدەست دەهێنا بە بێ ماندوو بوون!
وە چەندین کەسی ماندوو ، کە شەوانە و ڕۆژانە هەوڵیان دەدا ، شەونخونیان دەکرد بۆ کارەکەیان، زیاتر لە هەموو خەڵك هەوڵیان دەدا ، کەچی تامی سەرکەوتنیان نەکرد و نەکرد!
کەواتە نهێنیەکە لە هەوڵدانی زۆریش نیە.

چەندین کەسی هەژار و بێ سامان و دەرامەتم بینی ، کە بە شێوەیەکی باوەڕ پێنەکراو سەرکەوتنیان بەدەستهێنا و هەموو دونیایان سەرسام کردا!

وە چەندین کەسی سەرمایەدار و خاوەن دەسەڵاتم بینی کە تامەزرۆی سەرکەوتن بوون ، بەڵام بە حەیاتی خۆیان تامیی سەرکەوتنیان نەکردا!
کەواتە نهێنیەکە لە بونی پارە و سامانیشدا نیە!

چەندین باوکم بینی کە نە خوێندەواری هەبووە و نەهیچ شارەزایی زانستێك بووە، بەڵام کوڕەکەی بووە بە گەورەترین داهێنەری سەر زەوی!
وە چەندین باوکی داهێنەر و بەتوانام بینی کە کوڕەکەی نەزان و تەنانەت خوێندەواریشی نەبووە!
کەواتە نهێنیەکە بونی باوکی خاوەن زانست و زانیاریش نیە!

ئەی عەجەب ، دەبێ نهێنی کەسانی سەرکەوتوو و داهێنەر چی بێ؟!

سەرەڕای ئەوەی کە (خوێندەواری و سامان و باوکێکی داهێنەر و زیرەك و هەوڵدانی زۆر)، یەکێکن لەو شتانەی کە ڕێخۆشکەرن بۆ سەرکەوتن و شتانێکی گرنگ و پڕ بایەخن، ماندێلا لە یاداشتەکانیدا ئەوە باسدەکات کە کاتێك ئێمە کەسێکی سەرکەوتوو دەبینین ڕاستەوخۆ ئەوە دەڵێین کە ئەو کەسە باری دارایی و کۆمەڵایەتی زۆر باشە و دارایی زۆرە بۆیە کەسێکی سەرکەوتووە یاخود کەسێکە ئاستی

زانستی بەرزە کە بوەتە هۆی سەرکەوتنی.... ماندێلا ئەوە ڕەتدەکاتەوە و دەڵێ کە ئەمانە هەموویان هۆکاری دەرەکین ئەمانە پێوانەکردنی کەسی سەرکەوتوون بە شتی ماددی وە پێوەری دەرەکین، وە گرینگ و پڕبایەخن مرۆڤ دەبێ هەوڵ بۆ بەدەست هێنانیان بدات. وەلێ نابێ ئەوەمان لەیاد بچێت کە شتە ناوەکیەکان ئەو شتانەی کە لە ناخی مرۆڤەکاندان زۆر بایەخدارترن ، زۆر کاریگەرترن بۆ برەودان و بەرەو پێشبردن بە توانا سەرسوڕهێنەرەکانی ناخی مرۆڤ.

واتە بەبێ ئامادەباشی نێوەوە و ناخی مرۆڤ و بەبێ خودناسی و ئاشنابوون بە ناخ ئەستەمە ئامانجەکان بێنەدی،

گەر خودی کەسەکە لە ناخیدا ئامادەباشی بۆ سەرکەوتن نەبێت ، ئەوا زانست و ناوبانگ و سامان..... ئەم شتە دەرەکیانە هیچ کاریگەریان نیە لەم ڕێگەیەدا!

واتە:

نهێنی کەسی سەرکەوتوو لە بونی خوێندەواری و زانین دا نیە! بەڵکو نهێنیەکەی لەوە دایە کە تا چەند کارەکەی خۆش دەوێت!

نهێنی سەرکەوتن لە هەوڵدانی زۆر و شەونخونی زۆر دا نیە!! بەڵکو نهێنی لەوە دایە کە چۆن ئاسانترین ڕێگا بگرێتە بەر بۆ سەرکەوتن!

نهێنی سەرکەوتن لە بونی سامان یان نەبونی دا نیە! .. بەڵکو لە ناخی مرۆڤەکەدایە، هەرکە خودی مرۆڤەکە ویستی لە سەرکەوتن بوو وە

بڕیاریدا کە سەرکەوتوبێت، ئیتر هیچ شتێك ناتوانێ ڕێگر بێ لە بەردەم ویستی ئەم مرۆڤەدا!
نهێنی سەرکەوتن لە بونی باوکێکی داهێنەردا نییە، بەڵکو لە بونی باوکێکی هاندەردا یە کە ڕۆڵەکەی وا پەروەردە دەکات بڕوای بە خۆی هەبێت.
بەکورتی
نهێنی کەسی سەرکەوتوو لە خودی" خۆی" دایە، نهێنیەکە لە ناو ناخی کەسەکەدایە، واتە کەسەکە بڕیاردەدات کە سەرکوتوو بێت یان نا، واتە سەرکەوتن لەسەر خودی کەسەکە وەستاوە ، لەسەر ئەوە وەستاوە کە کەسەکە تواناکانی خۆی دیاری بکات و ئەو توانا شاراوانە بخاتە گەڕ و دەریان بخات لە واقیعدا.

## تایبەتمەندی کەسانی سەرکەوتوو

## (متمانەبەخۆبوون)

**ئەگەر تەنها باوەڕت بەوە هەبێت کە دەگەیت بە ئامانجەکەت، ئەوا تۆ نیوەی ڕێگاکەت بڕیوە !**

گەر لە ژیانی کەسانی سەرکەوتوو ورد ببینەوە ، ئەوا تێبینی دەکەین کە جیاوازیەکی زۆر لە نێوان ئەوان و کەسانی ئاساییدا هەیە ، بە ڕادەیەك ئەم جیاوازیانە هێندە ئاشکران و ڕونن کە بە ئاسانی دەتوانین هەستیان پیْ بکەین! ئەم جیاوازیانەش دەردەکەون لە (شێوازی بیرکردنەوە) ، (گفتوگۆ) ، و کارکردن . تەنانەت لە ڕێکخستنی کاتدا هەر زۆر ورد و هەستیارن!

ئەی باوەڕ بەخۆبوون؟! .. هێندە باوەڕیان بە خۆیان هەیە بە ڕادەیەك گەر دەست بە کردنی کارێك بکەن، ئەوا بیْ دودڵی و بەسەرکەوتوویی بە باوەڕبەخۆبونەوە کارەکەیان ئەنجام دەدەن و لە ئاست هیچ بەربەستێکدا کۆڵ نادەن هەتا کارەکەیان بەسەرکەوتوویی ئەنجام دەدەن.

**" چەتر باران ڕاناگرێت ،**

**بەڵام یارمەتیت دەدات لە کاتی باران باریندا،**

**بە هەمان شێوەش ، باوەڕبەخۆبوون شکستەکانت بۆ کەمناکاتەوە،**

**بەڵکو ڕێگای سەرکەوتنت بۆ ئاسان دەکات ! "**

## باوەڕبەخۆبوون

**گەر باوەڕت بە تواناکانی خۆت نییە..**

**هەرگیز چاوەڕێی سەرکەوتن مەکە!**

جیاوازی خەڵکانی سەرکەوتوو ئەوە یە کە خاوەنی بڕیارن و باوەڕیان بە تواناکانی خۆیان هەیە ، وە گوێ بە خەڵکی نادەن کە چی دەڵێن و ڕێگە نادەن ساردیان بکەنەوە..

ڕەنگە گرنگی متمانەبەخۆبوونت زیاتر بۆ دەربکەوێت دوای خوێندنەوەی ئەم بابەتە :

# ئاسك خێراترە لە شێر!

ئاسك بەشێوەیەكی زۆر زیاتر و خێراییەكی زۆرتری لە شێر هەیە كە شێرەكە هەرگیز ناتوانێت پێی بگات،

ئەی باشە بۆچی زۆربەی كات ئاسكەكان دەبنە نێچیری شێرەكان؟!

وەڵامەكەی زۆر ئاسانە ، چونكە ئاسكەكان هەمیشە ئاوڕدەدەنەوە بۆ دواوە ، لەبەر ئەوەی (باوەڕیان) بە تواناكانی خۆیان نیە ... بەمەش خێراییەكەیان كەمدەبێتەوە ، باوەڕیان بەوە نیە كە لە شێرەكان خێراترن ..... بۆیە چاوەڕوانی ئەوەن لەهەركاتێكدا بێت ببنە نێچیری شێرەكان بەمەش شێرەكان بە ئاسانی ئاسكەكان دەگرن.

ئێمەش گەر نرخی بەهێزی و بەهاداری خۆمانمان بزانین

بەدڵنیاییەوە سەردەكەوین

دەبێ باوەڕمان بە تواناكانی خۆمان هەبێت و بە خێرایی ڕابكەین بۆ ئامانجەكەمان.

## چۆن متمانەبەخۆبوون بەدەست بهێنین؟

"بڕیارم داوە بگەم بە ئامانج

جا یان سەردەکەوم

یانیش سەردەکەوم! "

دیل کارلینگی

ڕەنگە ئێمە گرینگی متمانەبەخۆبوون یان باوەڕبەخۆبونمان بۆ دەرکەوتبێت و دەیزانین، بەڵام ئێمە چۆن ئەو متمانەیە بەدەست بهێنین؟ کە ئەمەیە کێشە گەورەکە !

زۆربەی هەرەزۆری ئەو کەسانەی کە پلەی بەرزیان بەدەست هێناوە و ئەو کەسانەی کە سەرکەوتوو بونە و ئەو پەڕی داهێنانیان لە کارەکانیان کردووە ، گەر لێیان بپرسی : ئایا نهێنی سەرکەوتن چییە؟ ڕاستەوخۆ زۆربەیان دەڵێن : یەکەم نهێنی و یەکەم ڕێگە و یەکەم شتێك کە تۆ دەگەیەنێت بە سەرکەوتنەکانت (متمانە بەخۆبوون)ە .

باشە ، ڕەنگە زۆربەمان ئەوە بزانین کە متمانە بەخۆبوون یەکەم کلیلی سەرکەوتنە .. بەڵام ئێمە نازانین چۆن متمانە بەخۆبونمان بۆ دروست ببێت .... واتە دەزانین گرینگترین نهێنی سەرکەوتن متمانە بەخۆبونە بەڵام نازانین چۆن متمانەبۆخۆبوون بەدەست بهێنین.

ڕێگاکانی متمانە بەخۆبوون زۆرن و یەك و دوو نین ، بەڵام ئێمە یەك ڕێگا باس دەکەین کە زۆر گرینگە.

ئەویش ئەوەیە کە:

متمانە بەخۆبوون بەوە بەدەست دێت کە ئێمە (توانا شاراوەکانی) خۆمان بدۆزینەوە ، بزانین کە ئێمە چەندە بەتواناین ، بزانین کە ئەو توانایەی ئێمە هەمانە زۆر زیاترە لەوەی کە بیری لێ دەکەینەوە .. دەرك بە ناوازەیی ناخی خۆمان بکەین

بەڕاستی لە ناخی هەر مرۆڤێکدا گەنجینەیەکی زۆر ناوازە هەیە کە ئەگەر دەرکمان پێ کرد و بینیمانەوە ، ئیتر گەیشتووین بە بەنرخترین شت... بەڵام زۆربەی مرۆڤەکان سەیری ناخی خۆیان ناکەن.

لە لەناو ناخی هەریەکێ لە ئێمەدا توانای بێ سنور هەیە، دەی ئایا ئەوە بۆ بینابیمان ناخەنیە کار؟! بۆچی سەیری نێو ناخی خۆمان ناکەین ؟!

ئێمە هێندەی لە خەڵکی دەڕوانین و لێیان دەکۆڵینەوە و بیرلەوەدەکەینەوە کە ئەوان چی دەکەن و چی دەخۆن و چی لەبەر دەکەن، ئێمە هێندەی لە خەڵکی ورد دەبینەوە هێندە لەخۆمان ورد نابینەوە ! هێندەی خەریکی خەڵکین هێندە خەریکی خۆمان نین!

دەی بابێین سەیری ناخی خۆمان بکەین ، لە ناخی خۆماندا ورد بینەوە ، دەبا جارێك سەیری خۆمان بکەین

بزانین کە ئێمە چین و کێین
ئێمە زیاتر خەڵك دەناسین وەك لەوەی خۆمان بناسین!
گەر مرۆڤ دەرکی بەناوازەیی ناخی خۆی کرد
گەر پەی بەو توانایە برد کە هەیەتی
ئیتر گەورەترین گەنجینەی دۆزیوەتەوە

# تۆ زۆر ناوازەیت!

گەر بزانی مێشکی هەر مرۆڤێك چەندە بەتوانایە چەندە بە ناوازەیی بنیاتنراوە ، ئەوا دەرك بە تواناكانت دەكەیت ، دەرك بە لێهاتوویی و ناوازەیی خۆت دەكەیت ، دەرك بەوە دەكەیت كە سەركەوتن و گەیشتن بە ئامانج زۆر ئاسان بووە بەڵام ئێمە پێمان نەزانیوە !

بەپێی لێكۆڵینەوەكان مێشكی هەموو (مرۆڤێكی ئاسایی) وەكو یەكە، كە زیاتر لە 150 ملیار خانە پێكهاتووە .. ئەمەش ئەو بیانوە ڕەت دەكاتەوە كە هەندێ كەس دەڵێن:

مێشكم وەرناگرێت!

من تەمبەڵم!

لە هیچ تێناگەم!

ئەم قسانە تەنها بیانوون و هیچ ڕاستیەكی زانستی نین

مێشكی مرۆڤ توانای ئەوەندە بەهێزە كە هەرگیز بە خەیاڵی نەك مرۆڤەكان بەڵكو بەخەیاڵی زاناكانیشدا نایەت و هەر ڕۆژە و ناوازەییەكی تری ئەم مێشكەیان بۆ دەردەكەوێت!

گەر هەر تاکێك تەنها ٪40 ی مێشك بەکاربهێنێ ، دەتوانێ بە 7 زمان و بدوێ و 1000،000 کتێبی قەبارە گەورە لەبەربکات و 12 دکتۆرا بەدەست بهێنێ لە هەر بوارێکدا کە بیەوێت !! ئەمە تەنها بە کارپێکردنی ٪40 ی مێشك!

وە زاناکان دەڵێن
گەر کۆمپیوتەرێك هێندەی گۆی زەوی دروست بکرێت
هێشتا ناگاتە ئەو پارچە گۆشتەی کە لەسەری هەموو کەسێکدایە کە ئەویش مێشکە!

مێشکی (هەر مرۆڤێك) لە 15000000000 خانە پێك دێت، وە هەر خانەیەکیش لە 1000000 خانەی بچوکتر پێك دێت کە پێیان دەوترێت (سیناپس) ، وە هەر سیناپسێك لە 1000000 خانەی خەزنکردن پێك دێت!!
سەیری ئەو هەموو خانەیە .... ئێستا گەر بتەوێ ئەو سێ ژمارەیە لێکدانی یەکتر بکەیت و بتەوێ ئەنجامەکەی بنوسی یان بە دەم بیلێی، ئاوا : 1 ، 2، 3 ،4 ... تاکو دەگەیتە ژمارەی کۆتایی ئەوا پێویستت بە 5000 هەزار ساڵ زیاتر هەیە تاوەکو دەگەیتە ژمارەی کۆتایی!!

مێشکی مرۆڤ (100 بلیۆن) شانەی هەستە دەماری تێدایە کە ئەو ژمارەیە دەکاتە کۆی هەموو ئەو مرۆڤانەی کە هەتا ئێستا ژیاون لە مێژوودا

وە (100 تریلیۆن) پێکگەیەنەری شانەی هەستەدەماری هەیە کە دەکاتە کۆی هەموو ئەو ئیمەڵانەی کە لە جیهاندا دەنێردرێن لە ساڵێکدا

621000 مایڵ درێژی ئەو شانە هەستیارانەیەکە ئەمەش دەکاتە درێژیەکی خەیاڵی و درێژیەکە دەکاتە چونە سەر مانگ و هاتنەوە و شەش جار سوڕانەوە بەدەوری زەویدا !

وە خێرایی بیرکردنەوەی مێشك وەك خێرایی تیشکی ڕوناکی وایە! کە خێرایی ڕوناکی 300000000 ملوێن کیلۆمەترە لە چرکەیەکدا! مێشکی مرۆڤ تەنها لە یەك چرکەدا 2000000000 ملیار زانیاری خەزن دەکات!

گەر بێتوو ئەو زانیاریانەی کە تەواوی مێشك دەتوانێت هەڵی بگرێت، بخرێتە سەر کاغەز ئەوا 90000000 کتێبی زنجیرەیی لێ دەردەچێت! کە ئەگەر ئەم کتێبانە بخرێنە پاڵ یەکتری 450 کم درێژی دەبێت!

ئەی کە وایە ، کە مێشکی مرۆڤ هێندە ناوازەیە ، کە هەموو کەسێك ئەم مێشکە ناوازەیەی هەیە، بۆچی زۆرینەی خەڵکی لە بارودۆخێکی خراپدا دەژین؟

بۆچی زۆرینەی خەڵکی بێ توانان لەبەردەم کارەکانیاندا؟

بۆچی زۆرینەی خەڵکی سەرکەوتوو نین لە جێبەجێکردنی کارەکانیاندا؟

بۆچی مرۆڤانێك هەن کە بەردەوام گلەیی لەوە دەکەن کە مێشکیان بەکەڵك نایەت و سوودی بۆیان نیە؟

ئاخر چونکە ..... زۆربەیان ئەم ڕاستیە نازانن

زۆربەیان پەیان بەو نهێنیەی ناخیان نەبردووە

مەولانای ڕۆمی زۆر جوان باسی ئەو بابەتە دەکات و لە شعرێکدا دەڵێت:

قیمت هر کالە می دانی چیست؟

قیمتی خود را ندانی ابلهیست!

واتە: (نرخی هەموو کاڵایەك بزانی کە چیە

گەر نرخی خۆت نەزانی شێتییە! )

ئاخر ئەوەیە کێشەکە ، ئەوە کێشە سەرەکیەکەیە کە ئێمە نازانین کە چین ، نازانین کە کێین؟

نازانین کە ئەم گەنجینە ناوازەیەمان هەیە

زۆربەی خەڵکی وەکو ئاسکەکە وان، نازانن کە چەندە بەتوانان متمانەیان بە ناخی خۆیان نیە ، متمانەیان بە تواناکانی خۆیان نیە تەنانەت گەر ئەو ناوازەییەشی هەیانە بیزانن، کەچی هەندێك هەن کە دەڵێن ناتوانین و ئێمە توانای ئەوەمان نیە سەرکەوین و بگەین بەو شتەی کە دەمانەوێت.

ئێستا گەر مرۆڤێك هەست بەگەورەیی و ناوازەیی ئەم مێشکە بکات کە هەیەتی ..

کەسێك ئەمانە بزانێت حەتمەن بڕوای بە تواناکانی خۆی دەبێت و دەرك بە توانا لەبن نەهاتووەکانی خۆی دەکات ، ڕێڕەوی سەرکەوتن دەگرێتە بەر و متمانەیەکی قوڵی بۆ دروست دەبێـت کە کەسێکی بەتوانا و ناوازەیە، متمانەی بۆ دروست دەبێت کە ئەمیش توانایی هەیە بگات بە ئامانجەکانی .. ئەوەی بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەمیش توانای هەیە خەونەکانی بەدیبێنێ، هەرگیز ڕاناوەستێت و قوڵی لێ هەڵدەماڵێت و بەرەو سەرکەوتن هەنگاو دەنێ.

ئەمە ئەو شتانەن کە لە ناخی هەر کەسێکدا بونیان هەیە ... کەچی مرۆڤ نازانیٚ کە چەندە ناوازەیە، هەر دەڵێ: هیچ نازانم! ... تەمبەڵم! ..... مێشکم وەرناگریٚ!

دەی ئایا ئێستا کاتی ئەوەنیە کە بزانی تۆ کێیت؟
ئایا کاتی ئەوە نیە کە توانا بیٚ سنورەکانت بزانیت؟
ئایا کاتی ئەوە نیە کە دوربکەویتەوە لە گومانکردن لە تواناکانت؟
ئایا کاتی ئەوە نیە دەست هەڵگریت لە لۆمەکردنی خۆت و بەراوردکردنی خۆت بە خەڵکی؟

ئایا کاتی ئەوەنیە گویٚ بەو دەنگەی ناخت بدەیت
کە ئێستا پێت دەڵیٚ:
(( لەئەمڕۆ بەدواوە مەبە ڕێگر لەبەردەم تواناکانم))

ئایا کاتی ئەوە نیە کە داهاتووت بنیات بنێیت؟
ئێستا پڕ بە دڵ بڵێ : بەڵێ کاتیەتی ... کاتیەتی !

ئەها سەیرکە کە مەولانا چیمان پێ دەڵێ :

(تو یکی نیستی ای دوست و رفیق
بـلـکە گـردونـی و دریای عمیق)

واتە : (تۆ تەنها ئەوە نیت کە هەیت هاوڕێ
بەڵکو تۆ لەناوەوەدا گەردون و دەریای فراونی)

یان ئەوەتا لە شوێنێکی تر دا دەڵێت :

تۆ دڵۆپە ئاوێك نیت لە دەریایەکدا
بەڵکو دەریایەکیت لـە دڵـۆپێکدا!

(سەید قوتب)یش قسەیەکی زۆر جوانی هەیە کە دەڵێ:

(گەر جیهانی ناوەوەی مرۆڤ بەرجەستە بوایە ،
ئەوا ناوەوەو ناخی هەر مرۆڤێك ئەوەندە گەورە دەبوو ،
کە لەناو هەموو گەردووندا جێگەی نەدەبویەوە!! )

تۆ زۆر زۆر لەوە مەزنتری لەوەی کە بیری لێ دەکەیتەوە !

(جوبران خەلیل جوبران)

# تۆ زۆر لەوە گەورەتری کە بیری لیٚ دەکەیتەوە

(مەسعود لەعلی)

**گویٚت بیٚنە هاوڕیٚ! .... دەمەویٚ بە چپە شتیٚکت پیٚ بلیٚم:**

**"ئیٚمە نالیٚین کە تۆ دەکەینە کەسیٚکی ناوازە ،**

**نا نا ئیٚمە وا نالیٚین ، چونکە گەر وا بلیٚین ستەممان لە تۆ کردووە!**

**بەلکو ئیٚمە دەلیٚین تۆ**

**((تۆ هەر لە بنەڕەتدا کەسیٚکی ناوازەیت)) ،**

**ئیٚمە تەنها دەمانەویٚت کە بیرتبهیٚنینەوە**

**کە چەندە ناوازەیت! "**

## سەرکەوتووەکان کۆڵنەدەرن!

تایبەتمەندیەکی تری کەسانی داهێنەر و سەرکەوتوو ، بریتیە لە (کۆڵنەدان). واتە کاتێ بڕیاری کردنی کارێکیان دا ، ئەوە ئیتر بە دڵنیاییەوە ئەو کارە دەکەن، بێ دوو دڵی بەردەوام دەبن لەسەر ئامانجەکانیان.
هیچ شتێك نابێتە ڕێگر لەبەر دەم خەونەکانیان.
هیچ کەسێك ناتوانێت ساردیان بکاتەوە لە گەیشتن بە سەرکەوتن.
تەنانەت گەر چەندین جار شکست بخۆن، کۆڵنادەن تاوەکو سەرکەوتن بەدەست دەهێنن.

ئەو جۆرە کەسانەش زۆر دەگمەن و کەمن، ئەو سیفاتانەی سەرەوە تەنها لە کەسانی لێهاتوو دا هەیە، کەسێك کە زۆر بەتوانا و باوەڕی بە خۆی نەبێت، ناتوانێت دوای چەند شکستێك بەردەوام بێت لەسەر بەدەست خستنی خەونەکەی.

# کۆڵی نەدا...!

دوای ئەوەی دەستی بە بازرگانی کرد ، پاش ماوەیەکی کەم لە تەمەنی 24 ساڵی شکستی هێنا و سەرکەوتوو نەبوو.

بەڵام کۆڵی نەدا ...... بەردەوام بوو و دەستی کردەوە بە بازرگانی ....... دووبارە لە تەمەنی 31 ساڵیدا توشی داڕوخان بوو و گشت سامانەکەی لەدەست دا

دیسان کۆڵی نەدا و بۆ جاری سێیەم بە سەختیەکی زۆرەوە دەستی بە کارەکەی کردووە

جارێکی تر لە تەمەنی 34 ساڵیدا شکستی خوارد و لە تەمەنی 36 ساڵیدا توشی داڕوخان بوو

بەردەوام بوو لە ژیان کردن و ئەجار ڕووی کردە سیاسەت.

لە تەمەنی 38 ساڵیدا خۆی هەڵبژارد بۆ بوون بە ئەندام لە کۆنگرێس، دیسان سەرنەکەوت و شکستی هێنا!

بەڵام هەر کۆڵی نەدا.

لە تەمەنی 40 ساڵی جارێکی تر خۆی هەڵبژارد ....... چی بوو؟؟

.......... دیسان شکستی هێنا و هەڵنەبژێردرا !

لە تەمەنی 46 ساڵیدا جارێکی تر هەوڵیدا و بۆ چوارەم جا شکستی خوارد

لە تەمەنی 48 ساڵیدا دیسان نەیتوانی ببێتە ئەندام کۆنگرێس!!

**ئەم هەموو شکستە!**

**بەلاّم هەر کۆڵی نەدا**

**دوایی ویستی ببێتە جێگری سەرۆك...**

**دیسان شکستی هێنا!**

**بەلاّم نا!! ........ ئەو دیسانەکینەی بەردەوام بوو و کۆڵی نەدا تاوەکو لە تەمەنی 52 ساڵی بوو بەشازدەیەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.**

**کۆڵی نەدا و سەرکەوتوو بوو....**

**بەڵێ ئەم کەسە (ئەبڕاهام لینکۆڵن) بوو ، یەکێك لە بەناوبانگترین و سەرکەوتووترین سەرۆکەکانی ئەمریکا.**

**چی وای کرد ئەم پیاوە کۆڵ نەدا؟**

**بێ گومان ئەو باوەڕی بە تواناکانی هەبوو. لە شکست نەترسا. هەرگیز شکستەکان نەیان توانی چۆکی پێ دابدەن،**

**بەڵکو( ئەو چۆکی بە شکستەکاندا دا !).**

چەند پرسیارێك لە خۆتی بکە:

- ئایا تۆ چەندە باوەڕت بە تواناکانت هەیە؟
- چەندە هەوڵ دەدەیت بۆ گەیشتن بە خەونەکانت؟
- دوای چەندین شکست، هەر سوری لەسەر ئامانجەکەت؟
- شتێکی تر .. ئایا تۆ خەونێکت هەیە ، تاکو هەوڵ بۆ بەدەست هێنانی بدەیت؟

چونکە گەورەترین کێشە ئەوەیە ئێمە خەونێکمان نەبێت بۆی بژین!

ئامانجێکمان نەبێ بۆ ژیان!

## شکست ، چۆك بە سەرکەوتووەکان نادات!

شکست زۆر جار گەورەترین وانەیە بۆ کەسانی دانا، چونکە ئەوان باوەڕیان وایە گەر شکست بونی نەبێت ، ئەوا فێربونیش بونی نابێت ، واتە ( ئێمە لە خودی شکست نەگەیشتووین) ، بە شێوەیەکی تر لێی دەڕوانین... لە شکست دەترسین، بۆیە هەرگیز سەرکەوتوو نابین.
بەو واتایەی ئێمە دەبیٚ لە خودی شکست شارەزابین و لێی تێبگەین.

کەسە داهێنەرەکان هاوڕێی شکست بوونە، گەر لە ژیانی کەسە سەرکەوتـووەکان ورد بیتەوە ، دەبینیت کە ئەو کەسەی زیاتر توشی کێشە و دەردەســەری بووە زیاتر سەرکەوتوو تر و پلەی باڵاتریان بەدەست هێناوە!
واتە ئەوان هەتا وەکو شکستیان نەخواردبا، توشی سەرکەوتن نەدەبوون!

لێکۆڵەران ئەوە دەڵێن کە ئەو کەسانەی کە لەسەرەتای کارەکانیاندا توشی هەڵەی زیاتر دەبن ، لە سەرکەوتوترین کەسەکانن!
ئەمەش ئەوە دەردەخات کە شکست و چەرمەسەری ، مرۆڤ پێدەگەیەنیٚ نەك چەقبەستووی بکات.

دەمانەوێ مەسەلەکە لە کورتی ببڕینەوە!
ئەویش ئەوەیە گەر دەمانەوێت سەرکەوتوو بین، دەبێ شکست بخۆین!

ڕەنگە تۆ بلێیت چەندین جار توشی شکست بووین و هەر سەرکەوتوو نەبووین؟
ئەمەش باسێکی ترە .. چونکە هەموو مرۆڤێك شکست دەخوا، بەڵام سەرکەوتووەکان لە شکستەکانیان فێربوون، واتە دەبێ لە شکست (وانە فێربین) و دوبارەیان نەکەینەوە، ئینجا سەرکەوتوو دەبین.

کێشەیەکی تر هەیە کە خەڵکی پێیەوە گیرۆدەن و هەمیشە گلەیی لەدەست ئەوە دەکەن کە  هەمیشە بیریان لەلای هەڵەکانە و مێشکیان لەسەر ئەو فرسەتانەیە کە لە ڕابردوودا هاتوونە بەردەمیان ، یان هەمیشە بیر لەو شکست و هەڵانە دەکەنەوە کە لە ڕابردوودا توشی بوون ، وە بەو ڕادەیە بێزارن کە مێشك و بیریان زۆر بەو بابەتەوە سەرقاڵە وزۆر بێتاقەت بوون پێیەوە...
ئێمەش ئەوە دەڵێین کە هەڵەکردن یان شکست شەرم نیە ، بەڵێ شکست شەرم نیە و شتێکی زۆر ئاساییە ! ... تۆ سەیرکە کێ هەیە شکستی نەبێ؟ .. کێ هەیە لە ژیاندا هەڵەیەکی نەبێ؟ ... بێگومان

کەس نیە هەڵەی نەبێ لەم دونیایەدا .. هەموومان هەڵە دەکەین چونکە مرۆڤین ... مرۆڤەکان بۆ ئەوەی بزانن کە شتێك باشە یان خراپە ، دەبێ تاقیبکەنەوە .... لە تاقیکردنەوەشدا بێگومان توشی هەڵەکردن دەبین ... واتە کێشەکە ئەوەنیە کە ئێمە هەڵە دەکەین ، بەڵکو کێشەکە ئەوەیە کە ئێمە هەڵە دووبارە نەکەینەوە و سود لەو هەڵەیە وەربگرین کە ببێــتە پەند و وانەیەك بۆ داهاتوومان

ئەوەتا حەکیمێك دەڵێــت : (تاکە شتێك کە زۆرترین وانەی لێ فێربوومە ، هەڵەکردن بووە ! ) ... واتە مرۆڤ بە هەڵەکردن شتی نوێ فێردەبێ ، شتی تازە زیاد دەکات بۆ تورەکەی مەعریفەکەی ، ئەزمونی نوێ فێر دەبێ ، نەك هەر ئەوە بەڵکو گەر مرۆڤ هەڵە نەکات ، ئەوە هەرگیز فێر نابێت! زۆر بەی کەسە سەرکەوتووەکان بە هۆی هەڵەکردنەوە سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە ، ژیانی ئەو کەسانە بخوێنەوە کە سەرکەوتوو بوونە ، دەبینی ژیانیان پڕبووە لە شکست پڕ بووە لە هەڵەی زۆرگەورەوە پڕ بووە لەچەرمەسەری ، کە هەر ئەمەش بووەتە هۆی سەرکەوتنەکانیان.

ئێمە سەرکەوتوو نابین تاوەکو شکست نەهێنین ، سەرکەوتوو نابین تاوەکو تامی شکست نەچێژین ، ئێ بەم شێوەیەش فێر نابین تاوەکو هەڵە نەکەین..

بێنە پێش چاوت کە بۆچی زۆربەی خەڵکی سەرکەوتوونین؟ ... بۆچی؟ .. (چونکە لە هەڵەکردن دەترسن) ... سەرکەوتووەکان چونکە هەڵە دەکەن ، وتیشمان هەڵەکردن ئەزموونە ، بە ئەزمونیش سەرکەوتن دێت ... واتە کەسێك بیەوێ سەرکەوتوو بێت دەبێ ئەزمون وەربگرێ، ئەزمونیش لە هەڵە و شکستەوە دێت..

لێرەوە لەبەر ئەوەی سەرنەکەوتووەکان لە هەڵە دەترسن ، بەمەش هەڵە ناکەن ... بەو هۆیەشەوە ئەزموون وەرناگرن ، لە ئەنجامدا سەرکەوتن بەدەست ناهێنن چونکە هەڵە ناکەن !! ......

بەرەنجامی هەوڵ و کۆششی ساڵانێکی ئێوە پێدەچێت بە ساتێك و لە شەوێکدا وێرانبێت، و توشی شکست بن، بەڵام ئەم وێرانکارییە نابێت دەستتان لە هەوڵ و کۆشش پێ بکێشێتەوە،

نابێ شکستێك ببێتە هۆی چۆکدادانی ئێوە ،

نابێت بە شکستێك ژیانتان لێ تاریك بێت ،

کەواتە پێداگر و سەخت کۆش بن.

**گەورەیی مانای ئەوە نیە کە شکست نەهێنیت**

**بەڵکو**

**گەورەیی ڕاستەقینە ئەوەیە**

**کە بە بەهێزی بمێنیتەوە دوای هەر شکستێک !**

**"نیلسۆن ماندێلا"**

# سەرکەوتووەکان بە عیشقەوە کاردەکەن

ستیڤ جۆبز (دامەزرێنەری کۆمپانیای ئەپڵ) دەڵێت : تاکە ڕێگە بۆ سەرکەوتن لە کارەکەت ، ئەوەیە کارەکەت "خۆشبوێت".
دکتۆر "تارق سوەیدان"یش دەڵێت (گەر کارێکت خۆش نەوێت ، ڕەنگە سەرکەوتوو بیت تیایدا ، وەلێ ناتوانیت داهێنانی تێدا بکەیت)

گەر دەتەوێت سەرکەوتوو بیت و داهێنان بکەیت لە کارەکەتدا، دەبێ حەز و ویستت لەسەر کارەکە بێت و خۆشت بوێت. بە عیشقەوە کارەکەت ئەنجام بدەیت، گەرنا جگە لە ماندووبون و کات کوشتن هیچی تر دەست ناخەی ، تەنانەت کارەکەشت ناشیرین دەکەیت.

ڕۆمانونوسێکیش کە 35 ساڵ خەریکی نوسینی ڕۆمانەکەی بووە، دیاربوو کە لە کۆتاییەکانی نوسینی ڕۆمانەکەیدایە،
هۆن هۆن فرمێسك بەچاوانیدا دەهاتە خوارەوە ! ... هاوڕێیەکەی لێی دەپرسێ : بۆچی دەگریت؟
ڕۆمانوسەکە پێی دەڵێت:ئاخر پاڵەوانەکەم مرد ! پاڵەوانی ناو ڕۆمانەکەم مرد !

سەیرکە ، ڕۆماننوسەکە خۆی نوسیویەتی بمرێت، کەچی وەها ڕۆیشتۆتە ناو کەسایەتیەکەوە وا دەزانێ خۆی وایکردووە ، کەچی بۆی دەگرییێت!

ئەمەیە عیشق لە کارکردن .... ئەمەیە تێکەڵبوون لەگەڵ رۆحی کارکردندا.

خاڵێکی تر ئەوەیە کە کەسانی سەرکەوتوو چێژ لە کارکردن دەبینن، هەرگیز لە کارکردن ماندوو نابن.... ئەوەتا کاتێ ڕۆژنامەنوسێك بە ئەدیسۆن دەڵێ: باشە تۆ چۆن ماندوو نابیت، ڕۆژانە زیاتر لە 18 سەعات لە تاقیگەکەتدا کاردەکەیت؟!

ئەدیسۆنیش جوابی دەداتەوە و پێی دەڵێ: کوڕی خۆم، ئەمن کاتێ کار دەکەم خۆ ماندوو نابم، بەڵکو "دەحەسێمەوە!"

سەیرە!

کاتێ کاردەکا دەحەسێتەوە نەك ماندوو ببێت!

"ئێمە دوردەکەوینەوە لە کارکردن ،
بۆ ئەوەی بحەسێینەوە
ئەوانیش ڕادەکەن بۆ کارکردن
بۆ ئەوەی بحەسێنەوە !
بێگومان جیاوازی نێوان ئەو دووانەش
گەلەك زۆرە ! "

# خەونیان گەورەیە !

" دەترسم خەونەکانم بۆ خەڵکی باسبکەم
چونکە لە مێشکی خەڵکی جێگایان نابێتەوە!
ئەمەش نەک لەبەر گەورەیی خەونەکانم ،
بەڵکو لەبەر بچوکی مێشکی ئەوان! "

یەکێك لـە گرینگترین و جیاوازترین ئەو کارانەی کە کەسانی سەرکەوتوو لـە کەسانی تر جیادەکاتەوە، بونی "خەونی گەورە"یە! بەواتایەکی تر ، گەر دەتەوێت گەورەیی و پلـە و ئاستی کەسێك بزانیت، سەیری گەورەیی خەونەکەی بکە، هەتا هەندێك دەڵێن مرۆڤە گەورەکان لـە هەمووشتێکدا جیاوازن ، دەڵێن گەر بمەوێت گەورەیی جیهانی کەسێکم بۆ دەربکەوێت، ئەوا سەیر دەکەم چ دوعایەك دەکات! ئایا لـە دوعاکەی داوای شتی کاتی و یاری و شتە بچوکەکان دەکات، یان شتانی گەورە! بەکورتی گەورەیی کەسەکان لـە گەورەیی بیرکردنەوەیاندایە.

ئەو کەسانەی خەونی گەورەیان هەیە ، شتی گەورەش بەدەست دێنن!

## دەتەوێت ببی بە چی؟

لە یەکێك لە قوتابخانە هەژارنشینەکاندا مامۆستا لە قوتابیەکانی پرسی: کاتێك کە گەورە بوون ، دەتانەوێت بین بە چی؟

هەر یەك لە قوتابیەکان پیشەیەکیان بۆ خۆیان هەڵبژارد ، قوتابیەك وتی: پزیشك، یەکێکی تر ئەندازیار ، مامۆستا ، پارێزەر.. هتد.

تەنها یەك قوتابی نەبێت ، وتی: دەمەوێت ببم بە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا!

ئەم وەڵامە قاقای پێکەنینی لە نێو پۆلەکەدا دروست کرد ، و تەنانەت مامۆستاکەش دای لە پێکەنین و ئەم هەواڵە لە هەموو گوندەکەدا بڵاو بویەوە.

ئەم هەواڵە گەیشتە کەس و کاری منداڵەکە و دراوسێکانی ، هەمووان بە وەڵامی ئەو خوێندکارە قاقایان لێ دەدا، تەنانەت هەندێکیان ئامۆژگاریان کرد کە بیر لە شتی واقیعی بکاتەوە و ئەوەندە بەرز نەفڕێت!

ئەی ئەنجامەکەی ؟!

بەڵێ ئەم کەسە (بێڵ کلینتۆن) بوو ، کە بە کارەکانی ئەمریکای لە چەندین قەیران ڕزگارکرد.

ئەمیش نەك یەك جار، بەڵكو دوو جار هەڵبژێردراو بوو بە سەرۆكی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا!
گەر داوای شتی گەورە بكەیت ، شتی گەورەت دێتە ڕێ.

وەكو ئەو ماسیگرە نەبین كە كاتێ ماسی بچوكی دەگرت. هەڵی دەگرت و كاتێ ماسی گەورەی دەگرت، فڕێی دەدایەوە ناو ئاوەكە!
یەكێك بەلایدا تێپەڕی و لێی پرسی كە بۆ ماسی گەورەكان فڕێدەداتەوە ناو ئاوەكە؟!
ماسیگریش وتی: ئاخر ئەو تاوەیەی كە ماسی تێدا سوور دەكەمەوە، زۆر بچوكە و بەكەڵكی ماسی گەورە نایەت!

(بیری بچوك ، هەر شتی بچوكی تێدا جێ دەبێتەوە)

یان وەكو ئەو كابرایەی نەبین ، كە لە زەمانی بەغدایێ پارچە ئاڵتونێكی زۆر بە نرخی دۆزیبوویەوە، خەڵكی پێیان وت كە ئەم ئاڵتونە زۆر بەنرخە و پارەیەكی چاك دەكات . كابراش لەخۆشیان دوو قاچی هەبوون ، دوانیشی قەرز كردن و بە غاردان ڕادەكاتە بازاڕی و

دەیفرۆشێ ، زۆر خەنی دەبێت و دڵی خۆشدەبێت بەو پارانەی وەریگرتووە .

لە ڕێگادا خەڵکی لێی دەپرسن ئەو ئاڵتونە بە نرخەت بە چەند فرۆشت؟

ئەمیش دەڵێ: بە 100 درهەمم فرۆشت.

خەڵکیش لێی لە هەڵلا ئەدەن و کابرا شێت و هار دەکەن و پێی دەڵێن ئاخر چۆن ئەو ئاڵتونە گرانبەهایەت بە 100 درهەمی ڕەش و رووت فرۆشتووە؟!

پیاوەکەش بە سەرسوڕمانەوە دەڵێ: بۆ! ... چما لە ژمارە 100 زیاتر هەیە؟!

بینیت کە بچوکی بیرەکان چەندە کێشەیە!

یان لە کتێبی (زەردەخەنەی هیوا)دا ئەم بابەتە دەگێڕێتەوە کە دەڵێت:

زۆر کەس وەکو کابراکەی دێی کونە کۆتری لێ هاتووە، کە هەمووی دوو سێ ماڵێك دەبن لە دەڤەری ڕانیە.

کابرا دەڵێ : من قایمقایمی کونە کۆترم

هەندێك بۆ سوعبەت پێی دەڵێن : وەرە دەتکەین بە قایمقایمی ڕانیە.

یا بە پارێزگاری سلێمانی ... ئەویش دەڵێ: نامەوێ، من قایمقایمی کونە کۆترم! ... کابرا ئەوەندە لە دونیا حاڵی بووە و هەر ئەوەندەی تێگەیشتووە..

جا قەفەس هەر قەفەسە با لە ئاڵتونیش بێت ، بۆیە دەبێت لەو قەفەسە بێینە دەرەوە ، چونکە دونیایەکی فراوان چاوەڕێمانە.

مرۆڤ گەر توانا شاراوەکانی خۆی بینیەوە ، گەر دەرکی بە توانا لەبن نەهاتووەکانی خۆی کرد ، ئیتر خەون و ئاواتی گەورەی دەبێت، ئامانجی بەرز دەکاتە کاری خۆی ، گوێ بە شتە بچوکەکان نادات

گەر نەتتوانی ببی بە سنەو بەرێ بەسەر کێوانەوە،
دەوەنێ بە لە دۆڵدا...
بەڵام دەبێ چاکترین دەوەنی ئەوێ بیت!
گەر نەشتتوانی ببی بە دەوەن..
گژوگیا بە،
دڵڕفێنی بە ڕێ ببەخشە..
گەر نەتتوانی ببی بە ڕوەکی میسك
قامیش بە
بەڵام با گەشترین قامیشی نێو گۆماو تۆ بیت....
گەر نەتتوانی ببی بە شەقام
تولە ڕێ بە!
نەبوی بە خۆر
ئەستێرە بە!
بردنەوە و دۆڕان پێوەر نییە
هەرچیەك بویت
چاکترین بە!

"دۆگلاس مالاس"

زۆربەمان خەریکی شتە بچوکەکانین ، ئامانجمان شتی بچوکە ، تەنها شتە کەم بایەخەکان خەونی ئێمەن.

لە کاتێکدا تواناکانی ئێمە زۆر زیاترن ، ئەو هێزەی کە مرۆڤێك هەیەتی زۆر زیاترە لەوەی کە بە خەیاڵی ئێمە دادێت

ئێمە دەتوانین زۆر کاری ناوازە بکەین ، بەڵام تەنها شتە بچوکەکان ئامانجی ئێمەن !

## سەرکەوتووەکان لە ترس ، ناترسن!!

شێرەکانیش هەروەکو گیاندارەکانی تر سیستەم و ڕێڕەوی ژیانی خۆیان هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی زیرەکتر و جوداوازتر!
تایبەتمەندیەکانیان ئەوەیە کە بە شێوەی گروپ کاردەکەن و هێرش دەکەنە سەر نێچیرەکانیان.
بابەتەکەی ئێمە لەسەر شێرە پیرەکانە، واتە باسی ئەو شێرانە دەکەین کە تەمەنیان زۆرە و توانای ڕاکردن و گرتنی نێچیریان نامێنێت.
بەڵام سەیرەکە لەوەدایە کە ئەمانیش بێ کار نابن و سودیان لێوەردەگرن لە هێرشکردنە سەر نێچیر!
با بزانین چۆن؟
بەو پێیەی پیرە شێرەکان دەنگێکی گرژتر و بەسامتریان هەیە، بۆیە سوود لەو بەهرەیەی پیرە شێرەکان وەردەگرن و نێچیری چاکی پێ ڕاو دەکەن.
پیلانی هێرشکردنەکەش بەم شێوەیەیە:
پیرە شێرەکان لە شوێنێك خۆیان حەشاردەدەن و چاوەڕێی هاتنی ئاسکەکانن، شێرە گەنجەکانیش هێرش دەکەنە سەر ڕەوە ئاسکەکان و ناچاریان دەکەن بەئاڕاستەی پیرەشێرەکان ڕابکەن .

کاتێ ئاسکەکان لە پیرەشێرەکان نزیك دەبنەوە، پیرە شێرەکان بە هەموو تاقەتێ خۆیان دەنەڕێنن ، ئاسکەکانیش زیرە دەکەن و لە ترسی ئەم دەنگە سامناکە دەگەڕێنەوە دواوە بۆ لای شێرە گەنجەکان!
بەمەش چواردەوریان دەگیرێت و دەبنە ژەمێکی چەور و بەلەزەت لە بۆ شێرەکان.
ئێستا گەر ئاسکەکان بەردەوامبان لە ڕۆیشتن بەرەو شێرە پیرەکان، ئەوا ڕزگاریان دەبوو!
چونکە پیرە شێرەکان توانای راکردن و گرتنی نێچیریان نەماوە.
بەڵام "ترس"
بوە هۆی ئەوەی ئاسکەکان ببنە خۆراکی بەتامی شێرەکان .

ئێمەش زۆرجار لە دەنگەکانی دەوروبەرمان دەترسین، دەڵێین دەبێ ئەم دەنگە هی چ ئەژدیهایەکی گەورە بێت
بەڵام نازانین کە جگە لە دەنگ هیچێکی تر نیە!

ترست بشکێنە و
گەر بۆ یەکجاریش بێت ڕووبەڕووی ببەوە
جا دەبینی کە جگە لە دەنگێك، هیچێکی تر نەبووە!

## سەختیەکان ، مرۆڤ دروست دەکەن !

سەختیەکانی ڕۆژگار زۆرجار دەبنە وانە و پەند و ئامۆژگاری چاك بۆ خەڵکی ، زۆر بە دەگمەن و کەم هەیە کە ژیانی داهێنەرێك، فەیلەسوفێك، شاعیرێك، هونەرمەندێکی بە توانا، سیاسیەکی بەهێز بخوێنیتەوە و تێیدا بێت کە لەسەرەتای ژیانیەوە لە ناز و نیعمەتدا بوبێت، بەڵکو چەندین هەوراز و نشێو و بەربەستی گەورە و نارەحەتی و تاقیکردنەوەی زۆر قورس و دژواری لەبەردەما بووە
بەڵام بەهۆی بەهێزی متمانەبەخۆبونیان وە بەهۆی ئیرادەیانەوە چۆکیان بە هەر مەحاڵێکدا هێناوە، واتە بە کورتی دەکرێت بڵێین کێشە و نارەحەتیەکانی ڕۆژگار ، مرۆڤی گەورە دروست دەکەن!

بێنە بەرچاوت ، زەیتون وەختێ فشار دەدرێت ، ڕۆنێکی پوختمان دەداتێ، میوە کاتێك دەگوشرێت شەربەتێکی بەتامان وێدەدات، گوڵیش وەختێ وشك دەبێت و دەهاڕدرێت، بە بۆنی خۆش ئەفسوسمان دەکات.

وەختێ هەست دەکەیت خەمەکانی ژیان فشارت بۆ دێنن، نارەحەتیەکانی رۆژگار دەتگوشێت و بێ رەحمانە دەتهارێت .
خەفەت مەخۆ!
ئەوە خودا دەیهەوێت جوانترین شتەکانی ناخت وەدەر بێخێت!!

## سودبینین لە هەڵەی خەڵکی

یەکێکیتر لە نهێنیەکانی سەرکەوتووەکان ئەوەیە کە سوود لە هەڵەی خەڵکی تر وەردەگرن
جارێکیان لەلوقمانی حەکیم دەپرسن : ئەی حەکیم تۆ ئەو هەموو حیکمەتەی لە کوێوە فێربووی؟
حەکیم وتی: لە نەفام و گەمژان!
ئەمانیش وتیان : جا چۆن دەرس و عیبرەتێ لە گەمژان فێربووی؟!
حەکیمش وتی: ئاخر هەر کارێك ئەوان بیکەن، ئەمن لەو کارەی وەدوور دەکەوم و نایکەم . هەر ئەوەیە حیکمەت و زانین.
دونیا بەشی تاقیکردنەوەی ئەو هەموو کارانە ناکات ، بۆیە مرۆڤی زیرەك و هۆشیار سوود لە بچوکترین هەڵەی خەڵکی وەردەگرێت.

# گوێ بە خەڵکی مەدە!

**خەڵکی بەردی تێگرتم**

**منیش بە بەردەکان خانوێکی جوان و پتەوم دروست کرد!**

**"غاندی"**

یەکێك لە داهێنەرەکان دەگێڕێتەوە:

لە منداڵیدا ماڵمان نزیك هێلی شەمەندەفەر بوو، هەرکاتێك کە شەمەندۆفێرەکە لەوێوە تێدەپەڕی، منالەکان بەردبارانیان دەکرد، بەڵام کاتێ شەمەندەفەرەکە دەوەستا، هەموویان سڕ و سەرسام لەبەردەم گەورەییەکەیدا و بە ڕێزەوە لە بەرامبەریدا ڕادەوەستان ....!

ئەمە یاسای کۆمەڵگای ئێمەیە. مرۆڤ کاتێك وەستاوە ، شایەنی ڕیز و تەقدیرە، بەڵام کاتێ وەڕێکەوت و یەك دوو هەنگاوی نا ، کەمێك پێشکەوت و بوو بە لێهاتوو ... ئیتر خەڵکی چاویان پێ هەڵنایەت و کەس هاودەمی ناکات... تەنانەت بەرد بارانیشی دەکەن!

بەردەوامبە و گەر بەردبارانکرایت ،

واتە تۆ بەرەو پێشەوە دەڕۆیت!

" گەر خەڵکی توانجیان تیٚ گرتی ،

ئەوە بزانە تۆ لە پیٚشکەوتن دایت،

بۆیە توانجت تیٚ دەگرن!

گەر خەڵکی لە دواوە لیٚیان دایت

ئەوە بزانە کە تۆ لە پیٚشەوەی ئەوانی

بۆیە هەوڵ دەدەن کە پیٚت بگەنەوە!

گەر خەڵکی ڕەخنەیان لیٚ گرتی ،

ئەمە بەهۆی ئەوەیە کە تۆ زۆر لەوان باشتری

ئەمەش ئەوان دڵتەنگ دەکات

بۆیە جگە لە توانج و ڕەخنە و قسە هەڵبەستن

هیچیتریان لەدەست نایەت !"

( غاندی )

# هەورە ترشقە لە کوێ دەدات!

هەورە تریشقە تەنها لە مرۆڤە بەرزەکان دەدات، بۆیە خەمبار مەبە .....
کاتێك دوای هیلاکیەکی زۆر دەگەیتە لوتکە ...... لەناکاو توشی هەورە تریشقەی مرۆڤەکان دەبیت، ئەو کات لەیادت بێت کە هەورە تریشقە تەنها لە کێو و لوتکە بەرزەکان دەدات.
کاتێ کەسێك دەیەوێت بێزارت بکات یان بە دوای کەموکورتیەکانتدا بگەڕێت، یا هەوڵبدات کە تێکت بشکێنێت، ئەو کات لە یادت بێت کە ئەم هەورە تریشقەیە دەیەوێت بۆ دواوەت بگەڕێنێتەوە ........
ئەگەر تۆ نەگەیشتویت بە لوتکە ، چۆن هەورە تریشقە لێت دەدات.
ئەوان هەوڵ دەدەن بتروخێنن. بەڵام چونکە خۆیان ناتوانن وەکو تۆ بگەن بە لوتکە ، ناچار هەورە تریشقەت تێدەگرن ، بۆیە کۆڵ مەدە،
((کاتێك دێ ئەم هەورە تریشقانە بێزاردەبن لە بەردەوام بوونت!))

" لە ڕەخنە مەترسە
لە هیچ وڵاتێک
پەیکەری ڕەخنەگرێک دروست نەکراوە ! "

## خۆت بگۆڕە ... مێژوو دەگۆڕێت !

دەستوری ئاسمانە،
خۆت بگۆڕە
مێژوو دەگۆڕێت !
(مالیك بن نبی)

دکتۆر عوسمان هەڵەبجەیی دەڵێت:
مرۆڤی هۆشمەند و عاقڵ دەزانێت کە تەنها کەسێك کە توانای گۆڕینی خودی خۆمانی هەبێت ، خودی خۆمانین !
تەنانەت پەروەردگاریش هەرچەندە توانای گۆڕینی کەسەکانی هەیە، بەڵام کەس ناگۆڕێت ، بەڵکو گۆڕینی کەسەکانی داوەتە دەستی خۆیان، ئەوەتا دەفەرموێت:
(( بێگومان خوا بارودۆخی هیچ قەوم و گەلێك ناگۆڕێت هەتا ئەوەی کە لەدەرونیاندایە نەیگۆڕن)).
کەواتە گۆڕینی خودا بۆ کەسەکان پەیوەستە بە گۆڕینی خودی کەسەکانەوە.

**لە کلێسای وێست مینستەریش لەسەر گۆڕی قەشەیەك لە بەریتانیا نوسراوە:**

**"کە منداڵ بووم دەمویست دنیا بگۆڕم ، کە گەورەبووم بینیم دنیا زۆر گەورەیە و من پێویستە لەسەرم ئینگلیستان بگۆڕم، دواتر بینین ئینگلیستانیش گەورەیە و بە من ناگۆڕدرێت، بۆیە بڕیارمدا شارەکەم بگۆڕم**

**لە ساتەوەختی پیریشدا بڕیارمدا خێزانەکەم بگۆڕم**

**ئێستا لە گیانەڵای مردنم تێدەگەم کە گەر هەر لە سەرەتاوە (خۆمم) گۆڕیبایە ، لەوانەبوو بمتوانیایە دنیاش بگۆڕم !**

## بەهرەت لە چیدا، هەیە ئەوە بکە!

مستەر بین بەکالۆریۆسی لە هەندەسەی ئەلیکترۆنیدا هەیە ،
بەلاّم حەزی لە بواری کۆمیدیا بوو ، وە بڕیاریدا بچێتە ئەم بوارە .. وە لە ئەنجامدا توانی گەورەترین سەرکەوتن لە دونیای کۆمیدیادا بەدەست بهێنێت و ئێستا بەناوبانگترین ئەکتەری کۆمیدیایە لە هەموو جیهاندا.

ماهیر زێن لە تەمەنی هەشت ساڵی لەگەڵ خێزانەکەی لە لوبنانەوە چوون بۆ سوید و لە بەشی ئەندازیاری فڕۆکەوانی خوێندی.
بەلاّم زۆر حەزی لە بواری هونەر و مۆسیقا بوو ، پاشان چوو بۆ نیویۆرك .... لەوێ لەگەڵ هونەرمەندی جیهانی بواری پۆپ (مایكڵ جاكسن) كاری كرد. سەركەوتوو بوو و ئێستا یەكێكە لە ئەستێرەكان.

دكتۆر تاریق سوەیدان دكتۆرای لە هەندەسەی نەوتدا هەیە ،
دواتر لە بواری تر كاری كرد و بەرنامەی تەلەفزیۆنی و باسكردنی پرۆژەی بنیاتنانەوەی شارستانیەتی خستە ڕوو وە لە بوارەكانی كارگێری و گەشەپێدانی مرۆییدا كەسایەتیەكی ناوازەیە ، ئێستا یەكێكە لە كاریگەرترین كەسایەتیەكانی جیهانی عارەبی.

دکتۆر ابراهیم فقی باشترین یاریزانی تێنسی سەرمێز بوو وە نوێنەری میسر بوو لە پاڵەوانیەتی جیهانی تێنسی سەر مێز لە ساڵی 1969 وە دواتر بواری تری هەڵبژارد و سەرکەوتوو بوو تیایدا و بوو بە گەورەترین و کاریگەرترین کەسایەتی گەشەپێدانی مرۆیی و زیاتر لە 34 کتێبی نوسی ، لە تەواوی ژیانیدا نزیکەی 600،000 کەس لە بەرنامەکانیدا وانەی پێ وتونەوە.

بێڵ گەیتس خاوەنی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت، ئێستا دەوڵەمەندترین کەسایەتی جیهانە ، داهاتی بێڵ گەیتس لە داهاتی 141 وڵاتی جیهان زیاترە، بێڵ گەیتس دوای تەواوکردنی قۆناغی ئامادەیی ڕویکردە زانکۆی هارڤارد بۆ خوێندنی یاسا لە هەمان پیشەی باوکیدا، بەڵام حەزی زۆری بۆ کۆمپیوتەر هەبوو ، بۆیە لە بواری کۆمپیوتەردا ڕۆچوو و زانکۆی بەجێهێشت و گەورەترین سەرکەوتنی بەدەستهێنا ، ئەوەتا 90٪ ی کۆمپیوتەرەکانی جیهان بەهۆی بەرنامەکەی ئەوەوە ئیشدەکەن کە (ویندۆز)ە.

ئەو کارەی حەزی پێدەکەیت ئەنجامی بدە ،
ئەو شتە بەدەست دەهێنیت کە دەتەوێت.

## هەی ساقیت !

یەکێك لە کێشەکانی ئەم مەملەکەتە ئەوەیە کە زیرەکی هەر کەسێك بەپێی بەرزی و نزمی نمرەکانیەتی لە تاقیکردنەوەکان !

واتە گەر تۆ نمرەکانت کەمبوو پێت دەڵێن:

هەی فاشیل ! هەی ساقیت !

وا سەیرت دەکەن کە تۆ کەسێکی شکستخواردووی !

تۆ ساقیتی ! هەرگیز دەرناچیت

هەرگیز سەرکەوتوو نابیت لە ژیان!

ئەها ئەو کوڕەی برادەرت نەوەتی هێناوە و تۆش قەت دەرناچیت

ئەم کەسە دێننە سەر سفر و هیچ هیوایەکی بە ژیان نامێنێت !

لە کاتێکدا هەرگیز وانیە و هەرگیز بەرزی و نزمی نمرە پێوەری (سەرەکی ) نین بۆ دیاریکردنی زیرەکی و تەمبەڵی مرۆڤ !

ئەوەتا چەندین کەسایەتی کە نەك هەر زیرەك نەبوون ، بەڵکو لە مێژووی مرۆڤایەتیان گۆڕیوە لە کاتێکدا لە خوێندندا زۆر باش نەبوون و تەنانەت لە خوێندنیش دەرکراون یان خۆیان وازیان هێناوە ، لەوانەش : (ئەدیسۆن ، ئەنشتاین ، چەرچڵ ، نیوتن ، گاندی ، جوبران خەلیل جوبران، بیڵ گەیتس ، مارك زۆگەربێرگ ، ستیڤ جۆبز، سوکرات) و چەندینی تر ....

## سەرکەوتووەکان خاوەن پلانن

(بڕوس لی) پەی بەوە بردبوو کە نوسینی ئامانجەکانی زۆر گرینگە ، وە لەوە گرینگتر پلانە بۆ دەستخستنی ئامانجەکانی ، بەو پێیە "بروس لی" لە ساڵی 1970 دا نامەیەکی بۆ خۆی نوسی!

لە نامەکەدا نوسی:

(( تاکو ساڵی 1980 ، من دەبم بە ناسراوترین ئەستێرەی سینەما لە ویلایەتەیەکگرتووەکان و 10،000،000 $ دۆلار بەدەستدەهێنم)) !

بەڵێ هەوڵی دا .. پلانی دانا .. گەشبینبوو

ئەو بەر لەوەی لە تەمەنی کورتی 33 ساڵی دا بمرێت، لە سێ فیلم ڕۆڵی بینی

بەهۆی ئەو فیلمانە، توانی گەورەترین سەرکەوتن و خۆشەویستی و ناوبانگێکی فراوان لە سەرانسەری جیهان بەدەست بهێنێت.

توانی ببێتە گەورەترین و ناسراوترین ئەکتەری سینەما !

## بەڵکو هەر ئەمڕۆ دەمریت!

یەکێك لە کێشەکان ئەوەیە کە ئێمە نازانین بۆچی دەژین
حەزدەکەین بژین ،
وەلیٚ نازانین بۆچی، هەرئەوەندەی تەمەنمان درێژ بێت بەسە
دەگێڕنەوە پیاوێك چوو بۆ لای پزیشك و داوای لێکرد کە دڵنیای
بکاتەوە، ئایا ئەمیش وەکو باوکی دەتوانیٚ سەد ساڵ بژی یان نا.
کاکی پزیشك لەدوای پشکنین پرسی: تەمەنت چەندە؟
پیاوەکە وەڵامی دایەوە: 50 ساڵ.
پزیشك: ئایا دەچیتە گەشت و گەڕان و وەرزش کردن؟
پیاوەکە: نا ، بەهیچ شێوەیەك.
پزیشك: ئایا دەخوێنیتەوە؟
پیاوەکە: نەخێر.
پزیشك: ئایا بەرنامەی تایبەتی فێربوونت بۆ داهاتوو هەیە؟
پیاوەکە: نەخێر.
پزیشك: ئەی چ نەخشە و بەرنامەیەکت بۆ داهاتووی خۆت هەیە؟
پیاوەکە: هیچ شتێکی تایبەتی بە بیرم دا نایەت!
ئیتر پزیشکەکە توڕە بوو و بە کابرای وت: کەوابوو براله!
هەستە بڕۆ دەرەوە و بەڵکو هەر ئەمڕۆش بمریت!

ئیتر سەدساڵ تەمەنت بۆ چیە؟ گەر بەرنامەیەکت نەبێ
(مەسعود لەعلی)ش زۆر جوان ئەمە باس دەکات و دەڵێت:
ئێمە ئەوەندەی دڵتەنگی تەمەنمانین ، ئەوەندە لەبیری خۆی و جوانیەکانی ژیان ناکەینەوە!
چەندێتی تەمەنمان لە چۆنیەتی ژیان پێ گرینگترە
هەمومان دەمانەوێـت تەمەنێکی درێژمان هەبێـت ، زۆر بژین ، هەرگیز نەمرین !
بەڵام کاتێك کەسێك لێمان دەپرسێت کە چ بەرنامەیەکت هەیە بۆ داهاتوو؟ دەتەوێت چ کارێك بکەیت؟
ڕاستەوخۆ دەمان سکوت دەبێـت
ئەو کاتە بۆمان دەردەکەوێت کە هیچ بەرچاوڕونیەکمان بۆ داهاتوو نیە ، خاوەنی هیچ ئامانجێکی تایبەت نین، بە تەنگ جوانکردنی ژیانی خۆمان و ئوانیترەوە نین، تەنها دەمانەوێت بژین و زیندوو بمێنینەوە، جا بەچ جۆر و چەشنێك گرنگ نیە!

## حەز دەکەم ببم بە..

لە کۆنگرەیەکدا وتاربێژ لە ئامادەبووانی پرسی: چەند کەس حەز دەکەن  ببن بە ملوێنەر؟

بەنزیکەیی هەموویان دەستیان بەرزکردەوە.... وتاربێژ بەردەوام بوو:

چەند کەستان بەرنامە یا ڕێڕەوێکتان بۆ بوون بە ملوێنەر هەیە؟

زۆربەی دەستەکان داگیرانەوە ! ....

ئەم کێشەیە زۆر گەورەیە و زۆر کەس پێیەوە گیرۆدەیە

کێشەکە لە بێ پیلانی و بێ بەرنامەییدایە ، کێشەکە لەوەدایە ئێمە هێشتا خۆمان ناناسین ، هێشتا نازانین ئێیمە کێین، هێشتا مانای ژیانمان بۆ ڕون نەبوەتەوە

حەزدەکەین ببین بە هەمووشتێك ، حەزدەکەین سەرکەوتوو بین ، حەزدەکەین داهێنان بکەین، حەزدەکەین زیرەکترین بین ، جوانترین بین ، لێهاتووترین بین ... هەموو شتێ بین

بەڵام کە پرسیارمان لێ کرا پلانت چیە بۆ ئەوەی ببیت بەو شتە ، پلانت چییە بۆ ئەوەی ببیت بە لێهاتووترین، هیچ وەڵامێکمان نیە ، ئاخر چونکە ئێمە تەنها حەز دەکەین،

حەزکردنیش هیچ کارێك بۆ مرۆڤ ناکات.

## نهێنی سەرکەوتن چییە ؟

لە ڕوداوێکدا دارستانەکە گڕی گرت ، ئاگرێکی زۆر بڵێسەدار بوو ، بەخێرایی زۆربەی دارستانەکەی گرتەوە ، بەهۆیەوە زۆربەی دارستان ئاگری گرتبوو، ئاگرەکە زۆربەی گیاندارانی دارستانی لەناوبرد.

لەم ڕوداوەدا بێچووە شێرێك کە تازە لە دایك بوو بوو ، دایك و باوکی لە ناو ئاگرەکەدا گیربوون و مردن ، بێچوەکە بەرە و دەرەوەی دارستان ڕای کرد و ڕزگاری بوو.

بێچوە شێر ڕای کرد و گەیشت بە شوێنێك کە بە ناوچەی پشیلەکان ناسرابوو ، لەوێ بوو بە هاوڕێی پشیلەکان.

بێچووە شێر بە هۆی بچوکیەوە نەیدەتوانی خواردن دەست بخات و فێری ڕاوکردن نەبووبوو، بۆیە پشیلکان یارمەتیاندەدا و فێرە گرتنی مشکیان کرد و وردە وردە ڕادەهات بەو کەش و هەوایە.

دوای چەند ساڵێك شێرەکە گەورە بوو و ئەم هەر پێدەگەیشت و بوو بە شێرێکی بەهێز و زۆر بەتوانا کە دەتتوانی زۆر بە ئاسانی لەناو پشیلەکاندا جیاییکەیتەوە.

بەڵام ئەم شێرە شتێکی سەرسورهێنەری هەبوو کە لە بچوکیەوە بەردەوام بوو لەسەری ، ئەویش ئەوەبوو کە هەر سوور بوو لەسەر ڕاوکردنی مشك !

شێرەکە نەیدەزانی کە شێرە! چونکە لەناو پشیلەکاندا گەورە بوو بوو، خۆی بە بچوك دەزانی ، تەنها خۆی بە پشیلەیەکی لاواز و بێ توانا دەبینی !

نەیدەزانی کە ئەو چ شێرێکی ناوازەیە

نەیدەزانی  کە شتانێکی زۆر گەورەتر لە ڕاوکردنی مشك شایانی ئەون!

ئەو هەر وایدەزانی پشیلەیەکی بێهێزە وەکو ئەوانی تر و هیچیتر!

ئێستا گەر پرسیارێك بکەین: بۆچی ئەم شێرە هەر سورە لەسەر شێوازی ڕاوکردنی پشیلەکان کە ڕاوکردنی مشکە؟

وەڵامەکەی ڕوونە ئەویش ئەوەیە کە خۆی ناناسێت .. پەی بە هێزی خۆی نابات .. تواناکانی ناخی خۆی نابینێت!

ئێمەی مرۆڤیش وەکو شێرەکە واین ! خۆمان ناناسین ، تواناکانی خۆمان نازانین ، خۆمان بە بچوك دێتە بەرچاو

زۆرێك لە ئێمە خەریکی شتە بچوکەکان (مشکەکان)ین

لە کاتێکدا تواناکانی مرۆڤ زۆر زیاترە لەوەی کە بیری لێدەکەینەوە

مرۆڤ زۆر بەهێزترە لەوەی کە بە خەیاڵیدا دێ

پێویستە خۆمان بدۆزینەوە ، پەی بە نهێنیەکانی ناخی خۆمان ببەین بزانین کە کێین؟

واتە نهێنی سەرکەوتن ئەوەیە کە خۆمان بدۆزینەوە ، کە ئەمەش کورتەی ئەم کتێبەیە، کورتەی ئەم کتێبە چیرۆکی ئەو شێرەیە، ئێمە دەبێ خۆمان بناسین ، ئێمە ونبووین ونبووا وەکو شێرەکە ونبووین، ونبووی دایك و باوك نین، نا.. ئێمە ونبووین لەدەستخۆمان، ئێمە خۆمانمان ون کردووە، هەر کەسێك لە ئێمە لەسەریەتی کە خۆی ببینێتەوە ،

خۆی بدۆزێتەوە ،

مرۆڤ دوو توانای هەیە

یەکێکیان ئەوەیە کە وەك خۆی هەیە ، ئەویتریان ئەوەیە کە دەتوانێت ببێت

گەر سەیری گوێزێك بکەین ، ئەوە وەك خۆی کەهەیە ئەوە توانایەکە ، توانایەکی تر ئەوەیە کە گوێزەکە هەیەتی کە دەتوانێت ببێت بە دارگوێزێکی زۆر گەورە، واتە لەناو ئەو گوێزە بچوکەدا دارگوێزێك خۆی حەشارداوە ، دەتوانێـت ببێت بەو دارگوێزە.

لە ناو دەنکە خورمایەك ، دار خورمایەکی بەرز وبڵند بونی هەیە

لە ناو دەنکە قەیسیەکی بچوکدا ، داری قەیسیەکی زۆر جوان و پڕ میوە بونی هەیە

دەی مرۆڤیش ئاوەهایە

هەر مرۆڤێك، مرۆڤێكی ناوازەتر لە ناخیدا بونی هەیە كە دەتوانێت ببێت بەو مرۆڤە

وەك شێرەكە كە لە ناخی خۆیدا شێرە بەڵام نازانێت

مرۆڤیش لە ناخیدا زۆر ناوازەیە و توانایەكی زۆر سەرسوڕهێنەری هەیە

بۆیە پێویستە هەر یەكێك لە ئێمە خۆمان بدۆزینەوە ،

ئێمە خۆمان ونكردووە ..

مرۆڤەكان وەكو شاخی سەهۆڵ وان،

زۆر زیاترن لەوەی كە دەردەكەون.

# نهێنی سەرکەوتن چییە؟ 2

گەنجێك لە سوکرات دەپرسێ : ئایا نهێنی سەرکەوتن چییە؟

سوکرات بە گەنجەکەی گوت : بەیانی وەرە کەنار ڕووبار ، بۆ ئەوەی نهێنی سەرکەوتنێت پێ بلێم.

هەر هێشتا ڕۆژ لە نەهاتبووە دەرەوە گەنجەکە بە موشتاقانەوە غاریدا بەرەو لای ڕووبارەکە بۆ زانینی ئەو نهێنیە.

سوکرات بە گەنجەکەی وت با بچینە ناو ڕووبارەکە ، پێکەوە چونە ناو ڕووبارەکە تاوەکو ئاو گەیشتە ئەژنۆکانیان ، لەو کاتەدا سوقرات ملی گەنجەکەی گرت و دەناو ئاوێی هاویشت ، کورە گەنجەکە بەهەموو هێزیەوە دەیویست هەستێتەوە چونکە هەناسەی نەما ، بەڵام سوقرات زۆر لەو بەهێزتر بوو ، بۆیە بەسەریدا زاڵ بوو .

گەنجەکە ئەوەندە لە ژێر ئاوەکەدا مایەوە کە ڕەنگی ڕەش و شین بۆوە، لەکۆتاییدا سوقرات گەنجەکەی لەئاوەکە دەرهێنا، هەر کە گەنجەکە لە ئاوەکە هاتە دەرەوە یەکەم کارێك کە کردی ئەوەبوو کە بە هەموو هێزی خۆی هەناسەی قوڵی هەڵدەمژی.

ئێستا کاتی وانەکەیە ،

سوکرات لە گەنجەکەی پرسی :

" کاتێ لەناو ئاوەکە بووی، لە هەموو شتێك زیاتر موشتاقی چی بووی ؟ "

گەنجەکە بە ڕەنگ زەردی وتی : "هەوا"

سوکرات گوتی : "هەر کاتێ

ئەوەندەی موشتاقی هەوا بووی ،

هێندە موشتاقی سەرکەوتن ببیت ،

ئەو کاتە تۆ سەرکەوتن بەدەست دەهێنیت ،

نهێنیەکە هەر ئەوەیە و هیچیتر نیە! "

# شکێنەری بەربەستەکان

بۆ سەرکەوتن و گەشەکردن بێگومان چەندین بەربەست دێنە رێی هەر مرۆڤێك، کە پێویستە لەسەر هەر کەسێك کە بیەوێت سەرکەوتن بەدەستبهێنێت ، ئەم بەربەستانە بشکێنێت و نەبنە هۆی چۆکدادانی .

ئەم نمونانەی خوارەوەش سەلمێنەری ئەوەن کە هیچ بەربەستێك نابێتە رێگر لەبەردەم ویستی مرۆڤدا:

"میلتۆن" سەرەڕای ئەوەی کە نابینا بوو ، دەینوسی!

"نیلسۆن ماندێلا" لە تەمەنێکی زۆر گەورە و دوای زیندانیکردنی بۆ ماوەی 27ساڵ ئینجا لە تەمەنی 73 ساڵیدا بوو بە سەرۆکی ئەفریقای باشور و خەڵاتی نۆبڵ.

"بتهۆڤن" سەرەڕای ئەوەی کە یەکێك لە گوێیەکانی ناتەواو بوو ، مۆسیقای دەژەنی!

"هێلین کلێر" سەرەڕای ئەوەی کە لە تەمەنی 2 ساڵی بینایی و بیستنی لەدەست دا ، یەکێك بوو لە نوسەرە بەتواناکان و 17 کتێبی نوسی!

"چەك ئیگەر" فڕۆکەوانی بە توانا،ڕۆژێك پێش پێشبڕکێی فڕۆکەوانی لە ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە و دوو پەراسووی شکان، بەڵام کۆڵی نەدا و ڕۆژی دواتر بەشداری پێشبڕکێی کرد و ڕیکۆردی جیهانی شکاند!

"نیکۆلاس تێسلا" گەورەترین داهێنەری سەدەی بیستەم لە تەمەنی 18 ساڵی 6 زمانی دەزانی !
نوسەری بەناوبانگی ئەمریکی "لۆرا ئەلیزابێس" لە شەست و چوار ساڵیدا یەکەم کتێبی بڵاوکردەوە
"ڕای کرۆك" لە تەمەنی 51 ساڵیدا خواردنگە بەناوبانگەکی بەناوی ماکدۆناڵز دامەزراند
"مارك زۆگەربێرگ" لە تەمەنی 19 ساڵی فەیسبوکی دامەزراند!
نیوتن زیرەکترین کەسایەتی کە تا ئێستا مێژوو بەخۆیەوە بینیویەتی، تەمەنی تەنها 24 ساڵ بوو کە یاسای کێشکردنی دۆزیەوە !
ئەنشتاین ئەو کەسەی کە ڕێڕەوی مێژووی گۆڕی تەمەنی تەنها 26 ساڵ بوو کە بیردۆزی ڕێژەیی دانا!

"ئیدریسی" یەکەم دانەری نەخشەی جیهان ، لە تەمەنی 15 ساڵیدا کتێبێکی لەسەر جوگرافیادا دانا.
مەلالا یوسفی پاکستانی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی وەرگرت لە کاتێکدا تەمەنی تەنها 17 ساڵ بوو کە بچوکترین کەسە خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتبێت!

"یوانیس ئیکۆنۆمۆ" ی تەمەن 49 ساڵان کە وەرگێری یەکێتی ئەوروپایە ، 32 زمان دەزانێت و دەتوانێت بەسەرجەم زمانەکان بنوسێت و بخوێنێتەوە و کاری وەرگێرانیشیان لەسەر بکات ، لە کۆی 24 زمانی وڵاتانی ئەندام لە یەکێتی ئەوروپاش 21 زمانیان دەزانێت ، ئەمە جگە لە هەندێك زمانی تری جیهانی.

"نۆلە ئۆکس" ئافرەتێکی بەساڵاچووی بەریتانیایە و لە تەمەنی 95 ساڵیدا بڕوانامەی بەکالۆریۆسی زانکۆی بەدەستهێناوە و لە تەمەنی 98 ساڵیدا بڕوانامەی ماجیستێری وەرگرت ، وە هەروەها "نۆلە ئۆکس" لە تەمەنی 100 ساڵیدا یەکەم کتێبی خۆی بڵاو کردەوە بە ناوی "بێهیوابوون خیانەتە! " .

وە نۆلە ئۆکس دەڵێت کە " تەمەن، تەنها ژمارەیە و هیچی تر ! "

تاوانە کە بە وانە بڵێین کەم ئەندام !

تاوانە پێیان بڵێین پیر ! ....... تاوانە پێیان بڵێین ئەوانە هێشتا منالن !

ئەوەتا ئەوانە پێمان دەڵێن کە هیوامان بە ژیان هەیە

پێمان دەڵێن کە هیچ شتێك بەناوی مەحاڵەوە بونی نیە

پێمان دەڵێن کە هیچ شتێك نابێتە بەربەست لەبەردەم ئیرادەی مرۆڤدا!

مرۆڤەکان سەرەڕای نابینایی، کەڕی ، شەلی ، پیری ، هەژاری ، کەم تەمەنی ، کوێرەوەری یان نەخوێندەواری
بەسەر سەختیەکاندا زاڵ دەبن پێش هەمووان دەکەون
بەربەستەکان دەشکێنن و کارەکانیان تەواو دەکەن و سەرکەوتوو دەبن!
دەی هەرگیز بێ هیوا مەبە
هەتا کەمێك هەناسە بدەیت ، تاوەکو کەمێك ڕۆحت تێدا مابێت
کەمێك ئومێد مابێت ... تەنانەت هەلێکی زۆر بچوکیشت لەبەردەم بێت
بەردەوام بە ... هەرگیز مەوەستە

"تەنانەت کەسێک کە بە گۆج و ئیفلیجیش لەدایک بووبێت
گەر نەبێت بە پاڵەوانی جیهان
ئەوا هەر خۆی بەرپرسە ..!"
ژان پاوڵ سارتەر

# چەند وانەیەك بۆ سەركەوتن

## بۆ گەیشتن بە ئامانجە گەورەكان ، لە زمانە بچوكەكان مەترسن!

زۆربەی كەسە سەركەوتووەكان نەیانهێشتووە قسەی كەسانی تر كاریگەری هەبێت لەسەر چارەنوسی ژیانیان ، هەر ئەمەش بوەتە هۆی ئەوەی كە سەركەوتنی گەورە تۆمار بكەن.

تۆش گەر ئامانجێكت هەیە لە ژیاندا ئامانجەكەت مەكە قوربانی قسەی ئەو كەسانەی بە تواناكانت نازانن، گوێ لەو كەسانە مەگرە كە نازانن تواناكانی تۆ چەندەیە ، چونكە خۆت زیاتر خۆت دەناسیت! گەر وتیان تۆ ناتوانیت ، تۆش پێیان بڵێ سەیركە و بزانە چۆن ئەنجامی دەدەم!

سەركەوتنی كەسەكان لە خودی كەسەكانەوە دەست پێدەكات، هەر كەسێك لە دڵەوە باوەڕی بە سەركەوتنی خۆی هەبێــت و گەشبین بێت ، دەتوانێت گەورەترین سەركەوتن بەدەستبهێنێت كە بە بیری كەسدا نەهاتووە.

وەك لە بەشەكانی پێشوتردا باسی متمانەبەخۆبونمان كرد ، متمانەبەخۆبون گەورەترین كلیلی سەركەوتنی مرۆڤەكانە ، بەڵام زۆربەی جار ئەم متمانە بەخۆبونە نامێنێت و كەم دەبێت ، ئەمیش بەهۆی سەختی ڕێگاكە و هەوراز و نشێویەكانەوە ، متمانەبەخۆبوون

هەر وەکو مۆبایل و کۆمپیوتەر و زۆربەی ئامێرەکانی تر پێویستی بە بارگاویکردنەوەیە (شەحنکردن)ە بۆ ئەوەی متمانە دووبارە بەدەست بخەینەوە.

متمانە بەخۆبونیش بەدەست دێتەوە بە وەی کە هەمیشە بە گەشبینیەوە بڕوانینە توانا و لێهاتوویەکانمان و لە مرۆڤی ڕەشبین دوور بکەوینەوە و ژیانی کەسانی سەرکەوتوو بخوێنینەوە ، هەمیشە هانی خۆمان بدەین . خۆمان بە کەم نەزانین و نەهێڵین بەربەستەکان بن بە کۆسپ و لەبەردەم ڕێگاکەمان ، بەڵکو ئەم کۆسپانە بکەین بە پەیژە بۆ سەرکەوتنەکانمان.

وە هەمیشە ئەوەمان لەبیر بێت کە هیچ شتێك بە بێ ئازار و ماندوو بون و ڕەنج و تێکۆشان بەدەستنایەت، تەنانەت چێژ لە خۆشیەکانی وەرناگرین، گەر تاڵی نەبوایە شیرینی تامێکی نەدەبوو ، گەر ماندوو بون نەبوایە ، هەرگیز تامان لە حەسانەوە وەرنەدەگرت ، گەر زستان نەبوایە ، هاوین چ جوانیەکی بۆ ئێمە دەبوو؟! گەر شەو نەبوایە ، ڕۆژ چۆن خۆشەویست دەبوو لەلای ئێمە؟! هەموو شتەکان بە دژەکانیانەوە جوان و مانادارن.

بەو پێیە سەرکەوتن واتە زاڵ بوون بەسەر دژواری و سەختیەکانی ڕۆژگار ،

**سەرکەوتن واتە هەستانەوە دوای شکست ، سەرکەوتن واتە بێهیوا نەبوون،**

**سەرکەوتن واتە هەمیشە گەشبینی .**

**سەرکەوتن واتە دۆزینەوی کلیلەکانی متمانە بەخۆبون.**

**هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت**

**هیچ دیوارێك ناتوانێت لەبەرامبەر ئیرادەی مرۆڤدا بوەستێت و بەرگری بکات.**

# نرخی خۆت کەم مەکەوە !

من هەمان ئەو کەسەم کە لەگەڵ فلاّن کەس وێنەم گرتووە
من هەر ئەو کەسەم کە باوکم فلاّنە
من ئەو کەسەم جل وەکو فلاّن لەبەر دەکەم
من هەر ئەو کەسەم کە هاندەری فلاّن یاریزانەم
من هەمان ئەو کەسەم کە کتێبی فلان کەس دەخوێنمەوە
من هەمان ئەو کەسەم کە فلاّن مامۆستا وانەی پیۆ وتومەوە
من هەر ئەو کەسەم کە فلاّن کەس ، واژووی یادگاری بۆ کردووم
من هەمان ئەو کەسەم کە لەگەڵ فلاّن کەس خەڵکی گەڕەکێکین و لە یەك کۆلاّنین!
من هەمان ئەو کەسەم کە ....
ئەمە واتای ئەوەی گەر ئەم خەڵکە نەبێت، گەر وێنەی ئەوان نەبێت، گەر واژووی ئەوان نەبێت ، ئەوا ئێمە یەکسانین بە هیچ و هیچ مانایەکمان نیە ، گەر ئەوان نەبن ، واتە ئێمە بونێکمان نیە!
هەر جۆرە هەوڵێك بۆ خۆدانە پاڵ ئەوانەی کە لە ئێمە باشترن، نیشانەی خۆبەکەم زانینە و خۆ بەکەم سەیرکردنە،
ئەم کارە مانای ئەوەیە
ئێمە هیچ نرخێکمان نیە ..

پێشبڕکێیەك ڕێکخرا بۆ ئەوەی کە کەسێکی هاوشێوەی ئەکتەری بەناوبانگ (چارلی چاپلین) دیاری بکەن ، ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو (چارلی چاپلین) خۆیشی بە شداری لە پێشبڕکێیەکدا کرد ... لەوە سەیرتر ئەوەبوو کە چارلی چاپلین خۆی پلەی سێیەمی بەدەست هێنا لەو پێشبڕکێیەدا !

خۆت بە خۆت

تۆ بە تایبەتمەندیەکانی خۆتەوە جوانیت نەك بە لاسایکردنەوەی خەڵکی

تۆ خۆت بیت جوانترە نەوەك کە ببیت بە کەسێکی تر

هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت

گەر خۆت بەراوردکرد بە خەڵکی

لە نرخی خۆت کەمکردووەتەوە.

# ژیان

هیچ کەس ناتوانێت

ئەو شتەی کە هی تۆیە لێت بستێنێ

وە تەواوی دونیا ، ناتوانێت شتێکت بۆ بپارێزێت کە هی تۆ نیە ،

هەموو شتێك سادەیە

ژیان .. ئەشق ... خۆشویستن ...خوپێگرتن ... ڕۆیشتن ... هاتن ...

وەلێ شتێك کە سادە نیە و سەیرە

باوەڕنەبوونە بەو شتە سادانە !

وە گەر هەمیشە لە حەسرەتی ڕابردوو دا بیت

ئەمڕۆت لەدەست دەدەیت

تۆ یەك جار هەژدە ساڵ بووی

یەك جار دەبی بە سی ساڵ یەك جار دەبی بە چل ساڵە

یەك جار دەبی بە حەفتا ساڵ

لە هەر ساڵێکدا کە هەی ، ڕۆژانێکی جیاواز ئەزموون دەکەیت

بۆچی وەکو ڕۆژانی تر دوبارەی دەکەیتەوە ؟

هەر ڕۆژێك لە تەمەنی تۆدا جوان و قەشەنگە

وە چێژی تایبەتی خۆی هەیە

بەو مەرجەی کە بتەوێ بە تەواوەتی (بژی) .

# بێ هیوایی ، مردنە !

زاناکان مشکێکیان خستە ناو گۆزەیەکی پڕ لە ئاوەوە و لەناو تاریکیەکی ڕەهادا ( هیچ ڕوناکیەك نەیێتە ژورەوە) . پاشان کاتیان گرتەوە تا بزانن مشکەکە چەندێك دەتوانێ مەلە بکات ، تا ئەوەی سەرەنجام دەستبەردار دەبێت و نقوم دەبێت و حەیاتێ ڕەشی دەگاتێ و دەمرێ !.... بۆیان دەرکەوت کە مشکەکە تەنها و تەنها "سێ خولەك" دەتوانێ بەردەوام بێ لە مەلە کردن .... دواتر مشکێکی تریان خستە ناو ئەو گۆزەیەوە ، بەڵام لەبری ئەوەی بیخەنە ناو تاریکیەوە، ڕێگەیاندا پرشنگێکی بچوکی ڕوناکی لێ بدات و بە حاستەم و دوو بەڵا ڕوناکی دەهاتە ژورێ .... لەم دۆخەدا ئەم زانایانە توشی شۆك بوون کە بینیان مشکەکە ماوەی "16 سەعات" بەردەوام بوو لە مەلەکردن!
مشکەکە لەوشوێنەدا کە دەیتوانی ببینێت . بە هیوایەکی زیاترەوە لە هەوڵەکانی بەردەوام بوو!

ئەمە گەر لە بۆ گیانلەبەرانی تاقیگەیی ڕاست بێت. ئەی ئەبێ "هیوا" لە مرۆڤەکاندا چەندە کاریگەریەکی سەرسوڕهێنەری هەبێت.

**مرۆڤ دەتوانێ چل ڕۆژ بێ خواردن بژی**

**بەڵام بە بێ هیوا تەنیا دەتوانێ 4 چرکە بەردەوام بێت!!**

**گرینگترین شت لە ژیاندا**

**باوەڕبونە بەوەی کە :**

**تا کاتێک کە ئێمە زیندووین ، کە هەناسە ئەدەین**

**ئەوا هێشتا هەلێک هەر ماوە لە ژیاندا**

**"ئەدریان برودی"**

**گەر حەوت جار کەوتیت**

**جاری هەشتەم هەستەوە ، هەرگیز کۆڵمەدە !**

**"پەندی یابانی"**

## شکست یەکەم هەنگاوە بۆ سەرکەوتن !

هەر مرۆڤێك بیەوێت کە رێگای سەرکەوتن بگرێتەبەر دەبێ توشی سەختی و نارەحەتیەکی زۆر ببێت و بە بیابانی شکستێکدا تێپەرێت، ئینجا تامی ئاوی سەرکەوتن دەکات.
ئەوەتا چەند نمونەیەك لەسەر شکست و سەختی سەرکەوتن:

تۆماس ئەدیسۆن 292 جار شکستی هێنا لە داهێنانی گلۆپی کارەبایی (زۆرێك دەڵێن 9999 جار شکستی هێناوە ، ئەمە دوورە لە ڕاستەوە) ،ئەدیسۆن لە خوێندنگاکەی دەرکرا بە هۆی ئەوەی کە زۆر پرسیاری دەکرد، مامۆستاکەی پێی وت کە ئەم زۆر گەمژەیە و بە کەڵکی ئەوە نایەت کە هیچ فێر ببێت!

ستیڤ جۆبز لە تەمەنی 30 ساڵی توشی داڕوخانی ئابووری بوو و وە تەنانەت لە کۆمپانیاکەی دەرکرا کە خۆی بەشداربوو لە دامەزراندنی ، بەڵام دواتر گەورەترین داهێنانی کرد و ئێستا لەتەواوی جیهان ئامێرەکانی ئەو بەکاردەهێنن کە ئەویش بەرهەمی کۆمپانیاکەیەتی کە ئەپڵە.

احمد شوقەیری کاریگەرترین کەسایەتی جیهانی عەرەبی ، بەرنامەکانی ڕەتکانەوە چونکە پێیان وابوو کاریگەریەکیان نیە و بێ سوودن! ئێستا کاریگەرترین کەسایەتی جیهانی عرەبی دادەنرێت و 11 بەرنامەی ڕازەکانی پێشکەش کردووە.

کۆلۆنێل ساندەرز لە 1007 چێشتخانە شکستی هێنا و بیرۆکەکەی ڕەتکرایەوە، بەڵام کۆڵی نەداو دواتر گەورەترین زنجیرە چێشتخانەی دامەزراند بەناوی چێشتخانەی کۆنتاکی و ئێستا 11000 لقی لە سەرتاسەری جیهاندا هەیە بە کوردستانیشەوە!

چارلی چاپلین چەندین جار نمایش و کارەکانی ڕەت کرایەوە، چونکە پێیان وابوو ئەکتەرێکی لاوازە، بەڵام دوای چەند فیلمێکی کەم سەلماندی کە گەورەترین ئەکتەری سینەماییە!

والت دیزنی 302 جار کارەکانی ڕەتکرایەوە، لە کاری ڕۆژنامەنوسی دەرکرا بەهۆی ئەوەی کە (هیچ ئەندێشە و بیرۆکەیەکی نوێی نیە) بەڵام دواتر (میکی ماوس) داهێنا ، کۆدسەنتەری دامەزراند ، وە بەهۆی کارە داهێنەرەکانیەوە توانی 22 خەڵاتی ئۆسکاری وەربگرێت بەمەش

ناوی چووە مێژووەوە چونکە هیچ کەسێك ئەو ژمارە زۆرەی خەڵاتی ئۆسکاری تاوەکو ئێستا وەرنەگرتووە!

کۆمپانیای (هۆنداHONDA) لە کاری ئەندازیاری (تۆیۆتا TOYOTA) دەرکرا و بێکار مایەوە کە کۆمپانیای تۆیۆتا یەکێکە لە گەورەترین کۆمپانیاکانی بواری ئۆتۆمبێل ، بەڵام دواتر هۆندا بە تەنیا مۆتۆڕی هۆندای داهێنا و ئێستا کۆمپانیای هۆندا یەکێکە لە گەورەترین کۆمپانیاکانی جیهان و تەنانەت ڕکابەری کۆمپانیای تۆیۆتاش دەکات!

ج.ك.ڕۆولێنگ، خانمە نوسەری کتێبی بەناوبانگی جیهانی (هاری پۆتەر)، لەلایەن هاوسەرەکەیەوە تەڵاق درابوو ، هەوڵیدەدا کە منداڵەکانی بەخێوبکات لە کاتێکدا هیچ دەرامەتێکی نەبوو، کتێبەکەی لە لایەن 9 دەزگای چاپکردن ڕەتکرانەوە، بەڵام ئەمانە نەبونە بەربەست لەبەردەمیدا، کۆڵی نەدا و تەنها لە ماوەی 5 ساڵدا بوو بە یەکێك لە خانمە هەرە دەوڵەمەندەکانی جیهان.

دکتۆر سیوس بەناوبانگترین نوسەری چیرۆکی منداڵان لە مێژوودا ، 27 جار کتێبەکانی ڕەتکراوەتەوە بۆ چاپکردن.

ماکسی فیلەر لەدوای 48 تاقیکردنەوەی ( Bar Exam ) و 26 ساڵ لە هەوڵدان بۆ سەرکەوتن لە تاقیکردنەوە و خەرجکردنی $50000 دۆلار ، ئینجا توانی لە تاقیکردنەوەکەی دەرچێت و ببێتە پارێزەر!

(ئیدی ئارکارۆ) کاتێ دەستی کرد بە پێشبڕکێی ئەسپسواری، لە سەرەتادا لە 250 یاری پێشبڕکێدا شکستی هێنا و تەنانەت لە یەك یاریشدا نەیبردەوە، بەڵام کۆڵی نەدا و بەردەوام بوو تاوەکو یەکەم سەرکەوتنی بەدەستهێنا و ئیتر بەردەوام بوو تاوەکو ناوی خۆی لە مێژوودا نوسی وەك باشترین یاریزانی ئەمریکا و هەتا هەموو جیهانیش، ئەو توانی زیاتر لە 4000 یاری پێشبڕکێی ئەسپسواری بەرێـەوە !

ئۆپرا ، لە کارەکەی نزمکرایەوە چونکە پێیان وابوو بە کەڵکی تەلەفزیۆن نایەت، بەڵام دواتر بوو بە کاریگەرترین خانمی ئەمریکا و جیهان، کە بە ملیۆنان کەس سەیری بەرنامەکانی دەکرد.
مایکڵ جۆردن زیاتر لە 000،90 جار هەڵدانی تۆپی لەماوەی دەورانی یاریکردنیدا هەڵەکردووە لە نزیکەی 300 یاریدا دۆڕاوە،26 جار هەڵدانی کۆتایی پێ دراوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبووە.
لە تیپەکەی دەرکراوە چونکە لێهاتوو نەبووە

بەلام دواتر مایکڵ جۆردن شەش جار بوە پاڵەوانی باسکەی NBA.
وە مایکڵ جۆردن دەڵێت: شکستم هێنا شکستم هێنا و هەر شکستم هێنا ، (هەر ئەمەشە بوەتە هۆکاری سەرکەوتنم) !

وینستۆن چەرچڵ لە لایەن خێزانەکەیەوە پشتگوێ خرا چونکە لە خوێندنگا زۆرلاواز بوو ، زمانی دەیگرت و بە فسەزمانی قسەی دەرکرد، خەڵکی بە بێ کەڵك و تەمبەڵ ناویان دەبرد، بەڵام ئەم شتانە رێگرنەبوون لەوەی ببێتە سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا !

(ئەنشتاین) تاوەکو تەمەنی 4 ساڵی نەیتوانی قسە بکات و لە تەمەنی 7 ساڵی فێری خوێندنەوە بوو ، خێزانەکەی و مامۆستاکانی نیگەرانی ئەوە بوون کە مێشکی لەدەست دابێت، چونکە زۆر هێواش بوو لە بیرکردنەوە و کەسێکی کۆمەڵاتی نەبوو ، بەڵام ئەو کەسە دواتر بوو بە ئەفسانەی فیزیا و خاوەنی خەلاتی نۆبڵ و بوو بە یەکێك لەو چوار کەسەی کە مێژووی مرۆڤایەتیان گۆڕی کە ئەوانیش (گالیلۆ ، نیوتن ، داروین ، ئەنشتاین )بوون.

لۆدینگ ڤان بتهۆڤن مامۆستاکەی پێی وت ( مەحاڵە ببێت بە ئاواز دانەر ، هیچ هیوایەکم پێی نیە) بەڵام ئەم کەسە بوو بە ئەفسانەی مۆسیقا و شاکارەکانی بە هەموو دونیادا بڵاوە و گوێیەك نیە ناوی ئەمی نەبیستبێت

(ئەندرێ ئاگاسی) لە ساڵی 1995 لە پلەی یەکەمی باشترین یاریزانانی تێنس بوو ، بەڵام توشی پێکان بوو و بە ناچاری لە یاریکردن دورکەوتەوە، بەو هۆیەوە (ئاگاسی) لە پلەی یەکەمەوە دابەزی بۆ پلەی 141 ڕیزبەندی باشترین یاریزانانی تێنس لە جیهاندا ، بەڵام ئاگاسی کۆڵی نەدا و پاش چاکبونەوەی لە پێکان و ڕاهێنان و هەوڵێکی زۆر توانی دوای 17 مانگ بێتەوە پلەی یەکەمی باشترین یاریزانانی جیهان ! ئاگاسی پێنجەم یاریزانە لە مێژووی تێنسدا کە توانیویەتی هەر چوار پاڵەوانیەتیە گەورەکەی گراندسلام بباتەوە کە لە ئوسترالیا و فەرەنسا و بەریتانیا و ئەمریکا بەڕێوەدەچن.

وین دایەر یەکێك لە بەناوبانگترین نوسەرەکان، کە نوسینەکانی کراونەتە کوردیش، لە تەمەنی 30 ساڵی کتێبێکی نوسی ، 100 نوسخەی برد بۆ چاپخانەکان کەچی تەنها لەماوەی یەك هەفتەدا ، 99 دەزگای چاپکردن ڕەتیان کردەوە کتێبەکەی چاپ بکەن.

دکتۆر ابراهیم فقی بە شوشتنی قاپ و پاسەوانی هۆتێل و کرێکاری کورسی و مێز لە هۆتێلێکی سادە دەستی پێکرد دواتر زانستی گەشەپێدانی مرۆیی بنیاتنا و بوو بە شارەزاترین و کاریگەرترین کەسایەتی جیهانی و خاوەنی 5 هۆتێلی گەورە و گەورەترین چێشتخانە.

گەر تۆ تاوەکو ئێستا شکستت نەهێناوە،

ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە هیچ شتێکی نوێت تاقینەکردووەتەوە!

"ئەنشتاین"

هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت، هەرکات ڕێگایەکی بێ کۆسپ و

تەگەرە و بێ بەربەستت دۆزییەوە ،

دڵنیابە ئەو ڕێگایە ناتگەیەنێتە ئامانج !

کەوتن لە نێو قوڕ و لیتەدا شورەیی نیە،

شورەیی ئەوەیە لەوێدا بمێنیتەوە!

"محمد علی کلای"

**ژیان سەختە**

**وەلیٚ**

**من سەختترم !**

**"چارلی چاپلن"**

**گەر ژیان سەختتر بوو**

**ئێمەش بەهێزتر دەبین**

**خۆ هەر ئاوا تەماشا ناکەین !**

**ڕووداوەکان ،**

**کارەساتەکان ، سەختیەکانی ڕۆژگار**

**مرۆڤە گەورەکان بەهێزتر دەکەن و**

**مرۆڤە لاوازەکانیش تێکدەشکێنن !!**

**"مەولانای ڕۆمی"**

## سەرکەوتووەکان گوێ بە قسەی خەڵکی نادەن

یەکێك لە خاڵە هەرە دیارەکانی کەسانی سەرکەوتوو ئەوەیە کە گوێ بە قسە نەرێنیەکانی خەڵکی نادەن، هەمیشە گوێیان کەڕکردووە لە بەردەم قسە ڕوخێنەرەکانی خەڵکی ، نەك هەر ئەوە بەڵکو هەوڵیان داوە وەڵامی ئەم قسانە بدەنەوە کە لەبارەیانەوە دەکرێت ئەویش بە سەرکەوتن لە کارەکانیاندا.

گوێ بە قسەی خەڵکی مەدە ، چونکە ئەم خەڵکە تەنها لە ڕوانگەی تێروانینەکانی خۆیەوە لە تۆ دەڕوانێت ، بە پێی گەورەیی و بچوکی جیهانەکەی خۆیەوە بڕیار لە سەر تۆ دەدات ، بە پێی تواناکان و لێهاتوویەکانی خۆی لە توانا لەبن نەهاتوەکانی تۆ دەڕوانێت.

هەموو کەس لە خودی خۆیەوە لە خەڵکی دەڕوانێت
بۆیە گرینگی بە قسە نەرێنیەکانی خەڵکی مەدە، چونکە خۆت زیاتر خۆت دەناسیت ، تۆ توانا لەبن نەهاتوەکانی خۆت زیاتر شارەزایت.

## خەڵکی چی دەڵێن؟!

کاتێ لەدایك بووم، لە نەخۆشخانەیەکی گشتی، باپیرم بە دایکمی وت: تەنها نەخۆشخانەی تایبەت، دایکم ووتی بۆچی؟!

پابیرم وتی : ئاخر خەڵکی چیمان پێ دەڵێن ؟!

پاشان ویستم بچمە قوتابخانەی ئاسایی، دایکم ووتی: تەنها قوتابخانەی نمونەیی، باوکم ووتی : بۆچی؟

داکم وتی: خەڵکی چی دەڵێن؟

خولیای بواری زانستە کۆمەڵایەتیەکان بووم، باوکم وتی: تەنها بواری پزیشکی، بۆچی؟ خەڵکی چی دەڵێن؟

دەمویست لەگەڵ کچێکی گوندنشینیدا هاوسەرگیری بکەم، خوشکەکەم ووتی: مەگەر من بمرن، ووتم: بۆچی؟

ووتی : ئاخر نازانی خەڵکی چیمان پێ دەڵێن؟

دەمویست کاربکەم پارەی زەماوەندەکەم کۆ بکەمەوە، باوك و دایکم ووتیان مەگەر بەسەر تەرمی ئێمەدا بڕۆیت، ووتم: بۆچی؟

وتیان : خەڵکی چی دەڵێن؟

دەمویست بە پێی دەرامەتەکەم خانویەك بەکرێ بگرم، دایکم وتی: داکت بمریت، وتم: بۆچی.؟ وتی: خەڵکی چی دەڵێن؟

یەکەمین میوانداری دوای زەماوەندەکەمان دەمویست میوانداریەکی سادە بێت، هاوسەرەکەم ووتی: بەم زووییە شکست؟

ووتم: بۆچی؟! وتی: خەڵکی چی دەڵێن؟!
چیرۆکەکە بەردەوامە.....
دەمویست ئۆتۆمبێلێکی مۆدێل نزم بکرم، خێزانەکەم وتی: خوا مەرگم بۆ بێنێت!
ووتم: بۆچی؟ ووتی: خەڵکی دەڵێن چی؟!
ویستمان لە چارەخانەیەکی گشتی منالّمان ببێت، باوکم ووتی: تەنها چارەخانەی تایبەت، ووتم: بۆچی؟
"دیسان " وتی: (خەڵکی دەڵێن چی؟).
منالّەکەم ویستی بچێتە قوتابخانە...........بواری خۆی هەڵبژێریت............. هاوسەرگیری بکات.....
سەرەنجام ویستم بمرم، لەسەر قەبرەکەم بوو بە هەرا، کورەکەم وتی: لە خوارووی گۆرستان دەینێژین، ژنەکەم دەیقیژاند ، کورەکەم وتی: بۆچی؟ خەڵکی دەڵێن چی؟
لە کۆتایدا مردم و پێم وابێ ئیسراحەتمان کرد
نا!......... هێشتا عەزاب ماوە..
براکەم بۆ پرسەکەم مزگەوتێکی سادەی هەڵبژارد، خوشکەکەم بەدەم شین و گریانەوە دەیوت: خەڵکی چی دەڵێن؟
لە گۆرستان کێلێکی سادەیان بۆ مەزارەکەم دانا، بەڵام براکەم دەیوت: خەڵکی پێمان دەڵێن چی؟

**خۆی داوای بەردێکی مەرمەڕی بۆ کردم و وێنەکەمیان لەسەر هەڵکەند ، ئێستا لەماڵێکی چاڵی تەنگدا ژیان دەکەم.**

**تەواوی سەرمایەکەم بۆ رستەیەك بوو: ((خەڵکی چیمان پێ دەڵێن))**
**ئەو خەڵکەی تەمەنێك نیگەرانی قسەکانیان بووم،**
**ئێستا بۆ ساتێك ئەوان بۆ من نیگەران نین.**
**ئێمە**
**بە جۆرێك ناژین خۆمان پێمان خۆش بێت،**
**بەڵکو**
**(بەجۆرێك دەژین کەسانی تر پێیان خۆش بێت).**
**وەرە هاوڕێ گوێ بە قسەی خەڵکی مەدە و**
**سەربەرزانە بژی ،**
**ئاخر چیمان بە قسەی خەڵکی داوە.**

**شان و شکۆی ئێوە**

**زۆر لەوە زیاترە کە کەسێک ببێتە هۆی ئازاردانتان ،**

**بەتایبەت کەسێک**

**کە لە ژیانی ئێوەدا هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نیە !**

## هەر ئێستا دەست پێ بکە !

زۆربەی خەڵکی دەڵێن هیچ هیوایەك نیە و تازە درەنگ بووە و هیچ کارێکمان لەدەست نایەت.

لەکاتێکدا ، مرۆڤ تاوەکو هەناسە بدات ، تاوەکو کەمێك رۆحی لەبەردا مابێت دەبێت کار بکات و بەردەوام بێ لەسەر ئەرکەکەی . هەر ئێستا دەست پێبکە ، هێشتا درەنگ نەبووە ، هێشتا دەتوانی دەست پێبکەیت و تواناکانت بخەیتە گەڕ و هیواکانت بهۆنیتەوە ، هێشتا تەمەن بەشی ئەوە دەکات کە ئامانجەکانت بپێکیت و بەدەستیان بێنیت، ئیتر کاتی ئەوەیە تۆش بە خەونەکانت بگەیت ، ئەو یاسایەی ئارنۆڵد گەورەترین ئەکتەر و باشترین یاریزانی لەشجوانی ئەمریکی جێبەجێ بکە کە دەڵێت:

" کارێك کەسێك توانیبێتی بیکات، منیش دەتوانم ئەو کارە بکەم
گەر هیچ کەسێك نەیتوانیبێ ئەو کارە بکات
کەواتە باشتریش!
چونکە من یەکەم کەس دەبم کە ئەو کارە بکەم "
"ئارنۆڵد"

دەی تۆ چ جیاوازیەکت هەیە لەگەڵ ئەم خەڵکە، نە سامان و نە زیرەکی و نە مێشکی بەهێز و نە جەستەی سەلامەت پێوەرنین بۆ سەرکەوتن یان شکستی هیچ کەسێك

سەیرکە

تۆ کوڕی ئەنشتاین دەناسی؟

بێگومان نایناسی چونکە زیرەکی و ناوازەیی مێشکی ئەنشتاین هیچ سودی بە کوڕەکەی ناگەیەنێت

بەڵکو ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە ئەنشتاین خۆی بە هەوڵ و شەونخویەکانی خۆی بوەتە زانای سەدەی بیستەم

کورەکەی ئەنشتاینیش دەبێ بە هەوڵ وماندوبونی خۆی بگات بە ئامانجەکانی و ببێت بە زیرەکترین زانای سەردەم، نەك بە هۆی باوکیەوە

ئەی کوڕی بێڵ گەیتس خاوەنی کۆمپانیای مایکرۆسوفت و دەوڵەمەندترین کەسایەتی جیهان دەناسیت؟

بێگومان ئەویش ناناسیت چونکە سەروەت و سامان سورد بە کەسێك ناگەیەنێت بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بێت یان شکستخواردوو ... بەڵکو مرۆڤەکە دەبێ خۆی هەوڵ بدات بۆ ئەوەی بگات بە سەرکەوتن

مەبەستم لەم بابەتە ئەوەیە کە هیچ شتێك ڕێگر نیە لەبەر دەم مرۆڤ

بوون یان نەبونی سامان و نە کەم ئەندامی و نە کەم تەمەنی و نە پیری و نە نەخوێندەواری ... بەربەستی "سەرەکی" نین لەبەردەم مرۆڤدا، وە

پێوەری "سەرەکی "نین بۆ ئەوەی کەسێك بگەیەننە بەرزترین پلە، بەڵکو مرۆڤ خۆی بەربەستە لەبەر دەم خودی خۆیدا، خۆی فێڵ لە خۆی دەکات و بیانوو دەهێنێتەوە!

٪99 ی شکست خواردووەکان

ئەو کەسانەن کە عادەتی بیانوو دۆزینەوەیان هەیە !

"جۆرج واشنتن"

هەر کەسێ بیەوێ کارێک ئەنجام بدا، ڕێگایەکی بۆ ئەدۆزێـتەوە

هەر کەسێکیش نەیەوێ کارێک ئەنجام بدات

ئەوە بەهانەیەکی بۆ ئەدۆزێتەوە !!

هەرئێستا بڕیار بدە و دەست پێ بکە ، تۆش هیچ جیاوازیەکت نیە لەگەڵ کەسە سەرکەوتووەکان ، ئامانجەکەت بپارێزە و گوێ بە قسەی خەڵکی مەدە ، هەر ئێستا دەست پێ بکە

دڵنیابە گەر متمانەت بە خۆت هەبێت ، سەرکەوتوو دەبیت

گەر ئیرادەیەکی بەهێزت هەبێت ، دەتوانی بەئاسانی بگەیت بە خەونەکەت.

**هەرگیز بێ هیوا مەبە و چیتر کاتی خۆت بەفیڕۆمەدە و هەر ئێستا دەست پێبکە ....**

**بۆ مرۆڤە گەورەکان ڕێگرێک بوونی نیە**

**چونکە لەو باوەڕەدان کە**

**یان ڕێگەیەک دەدۆزنەوە بۆ سەرکەوتن**

**یانیش ڕێگەکەیەک دروست دەکەن بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن**

## "سبەینیٚ" چەکی شەیتانە !

دەڵێت : با مەکتەب تەواو کەم

با لە زانکۆ دەرچم

با ژن بێنم .... با گەورە بم

با پارە کۆبکەمەوە

با .... ئەوە و ئەوە بکەم !

با ... با .. با !

ئاخر کەی دەست پیٚ دەکەیت؟ کەی؟

تەنها کاتی خۆت بەفیڕۆ دەدەیت

فێڵ لە خۆت دەکەیت فێڵ!

چیتر خۆت فریو مەدە و دەست پێبکە

دەست بکە بە ژیانێکی نویٚ ...... هیوایەکی نویٚ

دەست بە کار بە بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکەت

# مەیبە ژێر گڵەوە !

بەڕێوەبەرێك بە كارمەندەكانی دەڵێت:

بەنرخترین شوێنی زەوی لە جیهاندا لە كوێیە؟

كارمەندەكانیش ناوی زۆر شوێن و وڵات دەڵێن.

بەڵام بەڕێوەبەر دەڵێت: نەخێر ، بەنرخترین زەوی لە جیهاندا (گۆڕستانەكانە)!

چونكە مرۆڤگەلێكی زۆری تێدایە،

كە زۆر بیرۆكە و قسەی جوانیان پێبوو، بەڵام نەیانكرد و لەگەڵ خۆیاندا بردیانە ناو گۆڕ

بۆیە ئامۆژگاری كارمەندەكانی كرد كە بە خاڵی بمرن و

هەرچیتان هەیە بیڵێن ، بینوسن ، ببەخشن ، مەیبەنە ژێر گڵەوە.

بۆیە ئێمە بە ئێوە دەڵێین كە

بەخاڵی بمرن

ئەو توانا و لێهاتوییەی هەتانە

مەیبەنە ژێر گڵەوە!

## سوود لە توانا شاراوەکانت وەربگرە

مرۆڤ زۆر لەوە بە تواناتر و بەهێزترە لەوەی کە بە بیریدا دێت، بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بیت دەبێ تواناشاراوەکانت بەکار بخەیت ،هەر وەك و لە باسی مێشکی مرۆڤدا ڕونمان کردەوە کە چەندە ناوازەیە ، دەی ئیتر کاتیەتی و سوود لەو توانایەمان وەربگرین ، ئێمە ئەو توانایەمان هەیە کەچی سودی لێ وەرناگرین

وەکو باسمان کرد وەکو ئەوە وایە کە گەنجینەیەك بدۆزینەوە ، کەچی لە شوێنێك بیشارینەوە و هیچ سودێکی لێ وەرنەگرین!

سودی هەر شتێك لە هەبونیدا نیە ، بەڵکو سودی هەر شتێك لە بەکارهێنانیدایە، ئیتر تواناکانت بخەگەڕ و سوود لەو گەنجینەیە وەربگرە.

ئەوانەی سەردەکەون یەك جیاوازیان لەگەڵ ئێمەدا هەیە ، ئەویش (بەکارهێنانی) ئەو توانایەیە کە هەیانە ، سوود وەردەگرن لە تواناکانیان و کاری پێدەکەن و دەیخەنە گەڕ.

## گەنجینەی بێ سوود !

پیاوێکی بازرگان هەرچیەکی هەبوو فرۆشتی و هەمووی گۆڕیەوە بە زێر ، پاشان زێرەکەی لە چاڵێکدا شاردەوە، هەمیشە سەری لیێ دەدا و سەرە و ژێری دەکرن ، ئەم کارەش یەکێك لە نۆکەرەکانی پێی زانی .

غولاٚم کە دەیزانی کە خشلێ و زێڕەکانی پیاوەکە لەم چاڵەدایە ، کاتیێ پیاوەکە لە ماڵ دەرچوو ، ئەمیش هەلەکەی قۆستەوە و چاڵەکەی هەڵدایەوە و هەرچی دارونەداری کابرای بوو هەمووی برد.

کاتیێ پیاوەکەهاتەوە سەر چاڵەکە و بە بە تاڵی بینی ، دەستی کرد بە شیوەن و گریان و قورپێوان ، توکی لە خۆی دەکردەوە و خۆی دەرِنی و بە سەر و چاوی خۆیدا دەکێشا.

یەکێك لەهاوسێکانی کە لە مەسەلەکە ئاگاداربوو پێی ووت :

خۆت نارەحەت مەکە و بەردێك بخەرە ناو چاڵەکە و وابزانە کە خشلێ و زێڕەکانە!

چونکە گەر بڕیارە تۆ سودێکیان لیێ نەبینیت ، ئەوا هیچ جیاوازییەکی نیە کە بەرد لە چاڵەکە دابن یان زێڕ و خشلێ !

بەها و گرینگی هەر شتێك لە هەبونیدا نییە ، بەڵکو لە بەکارهێنان و سودبینینیەتی، ئێمەش ئەو توانا شاراوانەی کە هەمانە با سوودی لێوەر بگرین و ئامانجەکانمانی پیێ بەدەست بهێنین.

# ئەو وتانەی کە هێزم پێ دەبەخشن !

***

## شتی زیاترت داوا نەکردووە !

کاتێ سەرکەوتوو نابیت ، کێشەکە ئەوە نیە کە بەختت نیە
بەڵکو کێشەکە ئەوەیە کە تۆ کارەکەت بە جوانی نەکردووە !
کاتێ پلەی یەکەم بەدەست ناهێنیت
کێشەکە ئەوە نیە کە تۆ ناتوانیت
بەڵکو کێشەکە ئەوەیە کە تۆ کەمتەرخەمیت کردووە بۆ بەدەستهێنانی ئەو پلەیە
کاتێ ژیان شتێکی جوانتر بە تۆ نادات
ئەوە هۆیەکەی ئەوەیە کە تۆ شتێکی زیاترت لەو داوا نەکردووە !
ئێستا تۆ خۆت بەراورد بکە:
باران دەباری ..... کەسێك کەوچکێکی هێنا بۆ کۆکردنەوەی باران
یەکێکی تر : قاپێکی گەورە!
هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت
بەپێی داواکاریت و خواستی خۆت
شتەجوانەکان بەدەست دەهێنی!

# شەرت نیە مانای دۆڕان بێت !

مەرج نیە
ئەوەی کە لەدەستی دەدەین مانای دۆڕان بێت
هەندێجار
دوور کەوتنەوە لە هەندێ کەس
ژیانت باشتر ئەکات
هەندێجار بەدەست نەهێنانی شتێك
دڵخۆشترت دەکات
هەندێجار بەخشینی زەردەخەنەیێ
ڕۆحت ئاسودەتر ئەکات
کەواتە هەمیشە لەدەستدان
مانای دۆڕان نییە !

# من بە توانام !

لە چی دەترسی ؟

لە شکست؟

یان لە قسەی خەڵکی؟

یان باوەڕت بە تواناکانی خۆت نییە ؟

وەرە و هاوار بکە و بڵێ:

من بەتوانام !

بڵێ:

من باوەڕم بە تواناکانی خۆم هەیە

پڕبە دڵ بڵێ:

من هەم !

بڵێ :

منیش دەتوانم کارەکانم ئەنجام بدەم !

وەرە توانا شاراوەکانت بەکاربێنە

هەموان سەرسام بکە بە کارەکانت

بۆ هەموانی بسەلمێنە کە تۆ بەهێزی

ئیتر دەست پێبکە و کاتی خۆت بەفیڕۆ مەدە

# هەمیشە لە گەشەدا بە !

گەر بێتوو ڕووەكێك بكریت لە بازاڕ ..... لەماڵەوە دایبنێیت ، پاشان لێی ورد بیتەوە كە هەرچەندە ئاوی دەدەیت و خزمەتی دەكەیت هیچ گەشە ناكات!
چاوەڕێ دەبی تا ماوەیەكی زۆر، كەچی هەر گەشە ناكات!
دوایی بۆت دەردەكەوێ كە ئەمە گوڵی پلاستیكە!
باشە كە ئێمە حەز بە گەشەكردنی ڕووەك دەكەین، بۆچی حەزمان لە پەرەپێدان و گەشەسەندنی خۆمان نیە و خۆشمان لێی نایەت!
مرۆڤێك گەر گەشە نەكات، وەكو ئەم گوڵە پلاستیكە وایە و مردووە ، كەس حەز بە چارەی گوڵی پلاستیكی ناكات.

گەر ناتوانیت بفڕیت ... ڕابكە
گەر ناتوانیت ڕابكەیت ... برۆ
گەر ناتوانیت برۆیت .. گاگۆلكێ بكە
هەرچیەك دەكەیت
گرینگ ئەوەیە بجولێیت
بەرەو پێشەوە بچیت و هەمیشە بەردەوام بیت لە ڕۆیشتن !

## سەختیەکان مرۆڤ دروست دەکەن !

مرۆڤ نازانێت تام و چێژی سەرکەوتن چیە، ئەگەر چەند جارێك شکست نەهێنێت.
نازانێت مانای پشودان و حەوانەوە چیە، ئەگەر توشی ئێش و ئازار نەبوبێت.
نازانێت دڵخۆشی چەند مانایەکی گەورەی هەیە، گەر بە خەم ئاشنا نەبوبێت !
شکستەکان سەرکەوتنەکان دەڕازێننەوە !
ئێمەدەکەوین ، بۆ ئەوەی هەستینەوە ، شکست دەخۆین، بۆ ئەوەی سەرکەوتی باشتر بەدەست بهێنین
دەدۆڕێین بۆ ئەوەی تامی سەرکەوتن بزانین !
دەی هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت
بەردێك بەرگەی لێدانەکانی چەکوش نەگرێت
هەرگیز پەیکەرێکی جوانی لیّ دەرناچێت
مرۆڤێکیش گەر بەرگەی نارەحەتیەکانی ڕۆژگار نەگرێت
هەرگیز کەسێکی سەرکەوتوو و نایابی لیّ درووست نابێت

دەی

گەر توشی نارەحەتیەکانی رۆژگار هاتی

گەر نارەحەتیەکانی ژیان بێزاری کردووی

گەر سەختیەکانی رۆژگار بێبەزەییانە ورد و خاشی کردووی

دڵتەنگ مەبە !

ئاخر سەختیەکان مرۆڤ دروست دەکەن !

مرۆڤ بە سەختیەکانەوە فێری خۆراگری دەبێت ، بە تاقیکردنەوە

سەختەکانی رۆژگارەوە دەبێت بە کەسێکی بە توانا

دەبێت بە کەسێك کە بەرگەی سەختیەکان بگرێت

بۆیە هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت

جوانترین باران

لە تاریکترین هەوردا دەبارێت

جوانترین پەیکەر

بەهۆی بەرگەگرتنی بە لێدانەکانی چەکوش دێتە بەرهەم

خۆشترین بۆن

بە هۆی هارین و پاڵاوتنی گوڵ دروست دەبێت

# حەز بە چی دەکەی؟!

حەزکردن یەکسان نیە بە بەدەست هێنان!

پرسیار لە چەندین کەس بکە کە حەز دەکەن بن بە چی؟ زۆر بەیان خولیای و حەزی گەورەیان هەبووە.

بەلاّم کە دەپرسین بەرنامە و پلانت چییە بۆ بەدەست هینانی ئەو شتە ؟

یەکسەر بۆت دەردەکەوێت کە ئەمانە جگە لە حەزکردن و خەیالٌ پلاّو هیچ شتێکیان نەکردووە بۆ ئامانجەکانیان!

هەر بۆیەش هەرگیز نایبەنەوە و لە جێی خۆیان ناجولێّن.

ئێ ئێمەش و زۆربەی خەلکی حەزدەکەین ئامانجی گەورە بەدەستبێنین پلەی یەکەم ببەینەوە و لە پێشەوەی هەموانەوە بین

بەلاّم بە حەزکردن هیچ کەسێك نە سەرکەوتوو بووە و نە هیچ شتێکی بەدەستهێناوە

گەر بمانەوێت سەرکەوتووبین دەبێ پلان دابنێین بۆ ئامانجەکەمان دەبێ بجولێّین ...... کاربکەین

# ئەڵماس و بەرد

جیاوازی لە نێوان ئەڵماس و بەردێکی ئاسایی چیە؟

هیچ!

لە ڕووی پێکهاتەییەوە هەردووکیان لە کاربۆن پێك هاتوون

ئەی گەر لەیەك جۆر مادده پێکهاتوون، بۆچی ئەڵماس نرخی هێندە بەرزە ؟

ئەڵماس زۆر پتەو و بەهێزە ، ڕەقترین مادەی سەرزەوییە و زۆر کەم هەیە، ئەمەش بەهۆی شێوازی دروستبونی ئەڵماسە

ئەڵماس بەوە دروست دەبێت کە بەردێك پەستانی 353،717،17 "تەن"ی بخرێتە سەر

واتە بۆ ئەوەی بەردێك ببێتە ئەڵماس، پێویستە کێشی 700 کێوی ئەڤەرست بخرێتە سەر بەردەکە!

خاڵی سەرج ئەوەیە: ... مرۆڤەکانیش بۆ ئەوەی بەنرخ بن

بۆ ئەوەی وەك ئەڵماس نرخیان بەرزبێت

دەبێ بەرگەی ناخۆشی و پەستانە سەختەکانی ڕۆژگار بگرن

کەسێ بیەوێ ببـێ بە حەکیم

هەر دەبێ دەستتاڕی ژیان بیهاڕێت !

# مەترسە ، هەنگاو بنێ !

دکتۆر مەحمود موعەززەمی نمونەیەکی زۆر نایاب دەهێنێتەوە سەبارەت بە بابەتی ترسان لە هەنگاونان ....

ئەو دەڵێ:

بێنە بەرچاوت کە تۆ بە شەو سەیارەت پێیە ، وە لە سلێمانیەوە دەچیت بۆ ڕانیە ، ئێستا پێمان بڵێ ئایا تۆ هەموو ڕێگاکە دەبینیت ؟ ئایا هەموو ڕێگاکە لە سلێمانیەوە تاوەکو ڕانیە ڕوناکە ؟

بێگومان نەخێر ، بەڵکو تۆ تەنها 100 مەترێکی بەردەمی خۆت دەبینیت کە ئەویش لایتی سەیارەکە ڕۆشنی دەکاتەوە...

دەی ئێستا تۆ چۆن دەتوانیت لە سلێمانیەوە بچیتە ڕانیە؟ خۆ تۆ ڕانیە نابینیت، وە ڕێگاکەش هەمووی تاریکە تەنها ئەو 100 مەترە نەبێت کە لایتی سەیارەکە ڕوناکی کردوەتەوە.

خاڵی سەرنج ئەوەیە : ڕاستە تۆ ناتوانیت ڕێگاکە هەمووی ببینیت ، بەڵام بە "ڕۆیشتن و هەنگاو نان" ، سەیارەکە ڕێگاکەی بەردەمی ڕوناك دەکاتەوە ، بەم پێیە تۆ هەر دەڕۆیت و لایتەکەش هەر بەردەمی خۆی ڕوناك دەکاتەوە ...

واتە: گەر بتەوێت بگەیت بە ئامانجەکەت هەر چەندە کە ئامانجەکەشت لێ دیار نەبێت ، ئەوا دەبێت هەنگاو بنێیت بەرەو پێشەوە ... دەبێ بەردەوام بیت لە جوڵە بۆ ئامانجەکەت بێ ترس .....

لە یابان داهێنانێکی عەجایەبیان دروستکردووە کە ئەو داهێنانە بەو شێوەیەیە :

لە گەرەکێکدا گەر کەسی لێ نەبێت ، ئەوا گلۆپەکان ئۆتۆماتیکی دەکوژێنەوە ،بۆ ئەوەی کارەبا بەفیڕۆنەچێت، بەڵام گەر هەر جوڵەیەك هەبێت، هەر نەفەرێك بەو کۆڵانەدا تێپەڕێت، ئەوا گلۆپەکان خۆیان ئۆتۆماتیکی پێدەبن و ڕێگای کابرا ڕۆشن دەکەنەوە ، هەر کە کابراش تێپەڕی ، گلۆپەکان دەکوژێنەوە.

ئێستا گەر تۆ بچیتە یابان و لەو سەری کۆڵانەکە بوەستی و بتەوێ بچیتە ئەو سەری کۆڵانەکە، هیچ نابینیت، گەر بتەوێ بیبینیت ، دەبێ هەنگاو بنێی ، دەبێ بچیتە پێشەوە بۆ ئەوەی گلۆپەکان پێ بن ، نەك ئەوەی لەجێی خۆت ڕابوەستی.

دەی هەنگاو بنێ بەرەو پێشەوە

بەردەوام بە لە ڕۆیشتن

بە بەردەوامبونی تۆ

ڕێگاکە خۆی ڕۆشن دەبێتەوە !

# بەڵام دەتوانین !

ئێمە ناتوانین کێشەکانمان بچوك بکەینەوە
بەڵام خۆ دەتوانین خۆمان گەورە بکەین لە بەرامبەر کێشەکاندا !
ئێمە ناتوانین هەموو شتێك کە خۆشماندەوێت بەدەستی بێنین
بەڵام خۆ دەتوانین ئەو شتەی بەدەستی دێنین .... خۆشمان بوێت !
ئێمە ناتوانین کە دەمی خەڵکی بگرین بۆ ئەوەی قسەمان پێ نەڵێن
بەڵام خۆ دەتوانین گوێمان بگرین و حسابێك بۆ قسە بێماناکانین نەکەین !
ئێمە ناتوانین بارودۆخی و ئاڕاستەی با بگۆڕین
بەڵام دەتوانین چارۆگەی کەشتیەکەمان بەشێوەیەك دابنێین کە هەمووکات بە مەبەستەکەمان بگەیەنێت !

# وشە نەرێنی !

ڕۆژانە دەیان وشە دەبیستین :

مەحاڵە ،

ناتوانم،

ئەستەمە ...

کە بونەتە هۆی شکست و بێهیوابوو

لەکاتێکدا ئەم وشانە جگە لە باوەڕی نەرێنی هیچیتر نین

بۆیە پێویستە هەمیشە خۆت لە وشەی نەرێنی بەدوور بگریت

بەڵکو هەمیشە بڵێ:

من باوەڕم بە خۆم هەیە!

بڵێ:

من دەتوانم!

بڵێ:

من سەرکەوتوو دەبم !

تاقیبکەوە، بزانە چەندە کاریگەری هەیە !

# گەر بتەوێت

پاولۆ کۆیلۆ لە ڕۆمانی کیمیاگەردا دەلێت:

گەر تۆ بە ڕاستی و بە تەواوی بونتەوە شتێکت بوێت

ئەوا هەموو گەردوون لە هەوڵی ئەوەدادەبن کە یارمەتی تۆ بدەن بۆ ئەوەی تۆ ئەم شتە بەدەست بێنیت!

بەڵێ !

گەر تۆ زۆر بە تامەزرۆییەوە و بەو پەڕی ویستنەوە شتێکت بوێت

ئەوا هەموو گەردوون و هەموو کەون لە یارمەتی تۆ دا دەبن بۆ بەدەست هێنانی ئەو ئامانجەت!

گەر تۆ ئەم شتەت بەدەست نەهێنا

ئەوە مانای ئەوەیە تۆ ئەو شتەت بە "تەواوەتی نەویستووە"

یان ئەوەیە کە تۆ هەوڵی تەواوت نەداوە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکەت

پۆزەتیڤانە بیربکەوە و بە سەختی و بەو پەڕی تواناوە کاربکە

لە کۆتاییدا ئەوەی دەتەوێ بەدەستی دێنی

# دەگونجێ بێتە دی

هێی هاوڕێ !

من نازانم تۆ چ خەونێکت هەیە

نازانم چ ئامانجێکت هەیە

وە ناشزانم تا چەندە متمانەت بۆخۆت هەیە

بۆ بەدەستهێنانی ئەو خەونەی کە هەتە

تەنانەت ئەوەش نازانم کە تۆ چەندە هەوڵداوە

بۆ بەدەستهێنانی ئەو خەونەت!

وەلێ ، لەوە دڵنیام

ئەو ئامانجەی کە تۆ هەتە

ئەو خەونەی کە تۆ هەتە

خەونێکی مەحاڵ نیە!

ئەو خەونەی کە تۆ هەتە ،

خەونێکی تەواوە

دەگونجێ بێتە دی

دەگونجێ خەونەکەت بێتە دی..!

# خۆت بڕیارت داوە کە وا بیت!

گەر کەسێکی شەرمنی
گەر کەسێکی توڕەیت
گەر بێ هیوایت
بێ ئامانجی
هەر شتێکیتر
ئەوە خۆت بڕیارتداوە کە وابیت !
کەس بەرپرس نیە
تەنها خۆت بەرپرسیت
لەو کارانەی کە دەیکەیت
وە هەر خۆتی کە بڕیاردەدەیت
کە کەسێکی سەرکەوتوو بیت
خاوەن ئامانج بیت
گوێ بە قسەی خەڵکی نەدەیت
دەی کەواتە خۆت بە !

# باشترین یان ... !

هەموو ڕۆژێ کاتێ کە منداڵەکە دەچوو بۆ خوێندنگە ، دایکەکە بە کوڕەکەی دەگوت: ئازیزەکەم ! من نامەوێ تۆ باشترین بیت ، تەنها دەمەوێت خۆشحاڵ و خۆشبەخت بیت...

ئەسڵەن موهیم نیە کە هەمیشە نمرەی 20 بهێنیت ، لە جێی 20 دەتوانی 15 بهێنی ، بەڵام ئەوەت لەبیر بێت کە لە دەورانی خوێندندا خۆشی ببینە ، لەزەت لە خوێندنەکەتدا بکە !

ڕۆڵەکەم : لە وشەی "باشترین" خۆد بەدوور بگرە ! چونکە ئاسودەیی کاتێ دێ ، کە خۆت بەکەسانی تر بەراورد نەکەیت.

هەتا نەتەوێــت کە خۆشبەختترین ببیت !

ئەوەت بوێــت کە خۆشبەخت بیت و لەپێناوی ئەوە هەوڵدە و هەر ئەوەندە و هیچی تر ..!

لە بیرت بێ کاتێ بەدووی "باشترینەکان" چووین ، خۆشبەختیمان لەدەست دا !

چێژمان لە نمرەی 19 نەبینی ، چونکە یەکێکی تر 20 ی هێنابوو !

لە لێخوڕینی سەیارەی سادە چێژمان نەبینی ، چونکە سەیارەی جوانتر لەسەر جادەکان هەبوون!

چێژمان نەبینی لەگەڵ خۆشەویستەکەمان ، چونکە ئەو پارەیەی ئێمە هەمان بوو ، کەمتربوو لە خەڵکانی تر !

بەو شێوەیە لە ماڵمان ، لە کارمان ، لە دەرامەتمان ، لە خانەوادەمان و دۆستانمان و .... بەکورتی لە تەواوی ژیانمان هیچ چێژێکمان نەبینی ... هیچ!

ئێمە لەژێر کاریگەری شتێانێکی هەڵەوەین کە ئەوانیش "باشترین و چاکترین و باڵاترین" ە ، وە ئەنجامەکەشی ئەوەیە مرۆڤ بەهۆیەوە هەمیشە لە دڵتەنگیدایە و هەرگیز ناگاتە ئاسودەیی ..

دەی ئیتر کاتی ئەوەیە کە لە ژێرگاریگەری ئەو بەهایانەوە بچینە دەرەوە و بیرێکی نوێیان لێ بکەینەوە گۆڕانکاریان تێدا بکەین، تاوەکو بەلایەنی کەمەوە ئەو نەخۆشیە بەرۆکی منداڵەکانمان نەگرێت..

ئەم بابەتە مانای ئەوە نیە کە ئێمە هەوڵنەدەین بۆ باشترین ، مانای ئەوە نیە کە ئێمە لێی پاڵدەینەوە و هیچ کارێك نەکەین بۆ بەدەستهێنانی شتە باشترینەکان، نا!

بەڵکو ئێمە دەڵێین کە خۆتان بەراورد مەکەن بە خەڵکی دەڵێین کە خۆشبەختیتان با پەیوەست نەبێت بە کەسانی ترەوە ، با پەیوەست بەوە نەبێت کە تۆ 19 بێنیت و ئەو کاتە دڵخۆش بیت کە کەس لە تۆ زیاتری نەهێنابێت !

نا ! هەر کاتێك هەر چەندێکت هێنا ، هەر چیت هەبوو ، هەر کارێکت دەست کەوت ، پێی دڵخۆشبە ، ئاسودەیی پیێ بەدەست بێنە ، نەك ئەوەی خۆت بەراورد بکەیت بە خەڵکی ...

## تەنیا یەك کەس

لە سەر زەویدا زیاتر لە 7 ملیار کەس دەژین
بەڵام
تەنیا یەك کەس تۆ دڵخۆش دەکات
تەنیا یەك کەس دەتوانیێ ژیانی تۆ بگۆڕێت
تەنیا یەك کەس دوژمنایەتی یان دۆستایەتی تۆ دەکات
تەنیا یەك کەس سەرکەوتنت پیێ دەبەخشێت
لە کۆتاییدا تەنیا یەك کەس (دڵی بۆ تۆ) لیێ دەدا
ئەویش
خودی خۆتیت!

## دوژمنە سەرسەختەکەم !

دوژمنێکم هەبوو
کە دەمامکدار بوو!
مکوڕانە هەوڵی دەدا بەرەنگاریم بێتەوە!
پلانەکانی پوچەڵ دەکردمەوە !
بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانم ، بەربەستی دەهێنایە ڕێم !
گاڵتەی پێ دەکردم و پێی دەوتم : (ناتوانی) !
شەوێکیان توند گرتم و دەستم دە قورگی نا ، هەوڵمدا دەمامکەی لابەرم
کاتێ لە ڕوخساری ورد بومەوە
توشی شۆك بووم، دڵم تێك هەڵهات
بەرچاوم تەنگ بوو ، هەناسەم سوار بوو!
چونکە ..... خۆمم بینی !
...
هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت
تاکە بەربەست لەبەردەم سەرکەوتنەکانت
خودی خۆتیت !

**لەم جیهانەدا**

**تەنها یەک کەس دەتوانێت**

**سنور بۆ خۆزگەکانت دیاریبکات و نەهێلێت پەرە بە خۆت بدەیت**

**،**

**ئەویش خودی خۆتیت !**

## کاپتنی بە توانا

هەر چەند زیاتر بە بزماردا بکێشیت

قایمتر دەبێت

گلەیی لە سەختیەکان مەکە

دەرهێنەری باش هەمیشە سەختترین ڕۆل

بە باشترین ئەکتەر دەدات

ئەو دەریایەی کە تۆفان و گێژەلۆکەی هەبێت

هەمیشە کاپتنی شایستە و بە توانا دروست دەکات

دەی هەمیشە سوپاسگوزاری ساتە دژوار و سەختەکانی ڕۆژگار بە.

# هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت!

هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت

سەرکەوتن ، خۆشبەختی ، ئاسودەیی .......

ئەمانە هەمووی دروست دەکرێن ، نەك بەدەستیان بهێنیت!

کەسانێك هەن کە بە ئاڕاستەی کەشتی مەلە ئەکەن

کەسانێکیتریش هەن کە لە چاوەڕوانی کەشتیدا

کاتەکانی خۆیان بەفیڕۆدەدەن!

کەسانێك هەن کە لە چاوەڕوانی هاتنی خۆشبەختی دان

کەسانێکیتر هەن کە خۆشبەختی بۆ خۆیان بەرهەم دەهێنن!

کەسانێك هەن کە سەرکەوتن بە دەستی خۆیان دروست دەکەن

کەسانێکی تر هەن کە لە چاوەڕوانی هاتنی سەرکەوتن تەمەنی خۆیان بەفیڕۆئەدەن..!

# تەنها ئەمڕۆت هەیە

هەر ڕۆژێك بەیانیەكەی كە چاوەكانت دەكەیتەوە ئەوە بە خۆت بڵێ:
من توانای ئەوەم هەیە كە ئەمڕۆ هەڵبژێرم كە شادبژیم یان غەمگین!
مافی هەڵبژاردن بەدەست خۆمە ، من هەڵدەبژێرم كە دڵخۆش بم یان دڵتەنگ !
هەمیشە ئەوەت لەبیر بێـت
گەر تەنها یەك هەلت لەبەردەم بێت بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەكەت
ئەوە ئەو هەلە هەر ئەمڕۆیە
چونكە دوێنێ ڕۆیشت
بەیانیش هێشتا نەهاتووە
تۆ تەنها ئەمڕۆت هەیە
دەی شاد بەو سوودی لێ ببینە ...

## عەینەك ڕەشەكان!

هەندێك مرۆڤ هەن كە ناویان عەینەك ڕەشەكانە

ئەم عەینەك ڕەشانە

گەر توشی سەختیەكی بچوك ببنەوە ، تەنها كێشەیەكی زۆر بچوك توشیان بێت

تەنها كەمێك ئازاریان پیَ بگات ، تەنها دڕكێك بە قاچە ناسكەكەیان بگات!

ڕاستەوخۆ دونیایان لیَ دێتەوە یەك و بەرچاویان تەنگ دەبێت

دەڵێن: ئاخ مردن لە كوێی ژیان كوشتمی!

بە تەنها یەك شكست ، تەنها یەك كەوتن ئاوا بیَ هیوا بیَ

هەموو شتێك بە ڕەش ببینێت و تاریكی زاڵ بكات بەسەر دەرونیدا!

پێویستە ئەم عەینەكە ڕەشانە فڕیَ بدەین

وەك "سوهراپ سپیهری" دەڵێت پێویستە هەر مرۆڤێك چاوەكانی بشوات

بەشێوەیەكی ڕەشبینانە نەڕوانینە ژیان

ژیانێكی پڕ لە هیوا بەرهەم بهێنین ، ژیانێك كە ئومێد بەخش بێت

ژیانێك كە هەمیشە بە گەشبینیەوە بڕوانێت..

# لەسەر بڕیاری خۆتەوە بەندن

ڕاستە تۆ ناتوانین بگەڕێیتەوە بۆ ڕابردوو و هەڵەکانت ڕاست بکەیتەوە
وەلێ دەتوانی سوود لە هەڵەکانت وەربگریت و دوبارەیان نەکەیتەوە
دەتوانی لە ئێستاوە دەست پێبکەیت و داهاتوویەکی جوان درووست بکەیت

ڕاستە تۆ ناتوانیت شکست لە خۆت دوور بخەیتەوە
وەلێ دەتوانیت شکستەکان بکەیتە پەیژەیەك بۆ سەرکەوتنەکانت!

ڕاستە تۆ ناتوانی هەمیشە ئەو شتە بەدەست بێنیت کە خۆشت دەوێت
وەلێ دەتوانی ئەو شتەی بەدەستت هێناوە ، ئەو کارەی دەکەی ئەو بەشەی لێی دەخوێنی ، خۆشت بوێت!
بەکورتی ئەم شتانە لەسەر بیرکردنەوە و بڕیاری خۆتەوە بەندن، نەك تۆ بەم شتانەوە بەند بیت
ئەم شتانە لەژێر کۆنترۆڵی تۆ دان ، نەك تۆ لەژێر کۆنترۆڵی ئەواندا بیت

# گرینگ ئەوەیە دڵخۆش بیت!

گەر مرۆڤێك لە یاریەکدا یان لە وەرزشێکدا کاتێکی خۆشی بەسەر برد و چێژی لە یاریەکە وەرگرت
ئەوە ئەو کەسە براوەیە، هەرچەندە کە یاریەکەشی بدۆڕێنێت
گرینگ ئەوەیە کە تۆ خۆشبەخت و ئاسودەبیت
ئەوە گرینگە کە تۆ دڵت خۆش بێت نەك نارەحەت!
ئاخر زۆر سەیرە ئێمە بۆ ئەو کارە دەکەین، بۆ دەخوێنین، بۆ سەیری فیلم دەکەین، بۆ وەرزش دەکەین، بۆ یاری دەکەین...
بۆچی؟
بۆ ئەوەی کە پشویەك بە ڕۆحمان بدەین ، بۆ ئەوەی ئاسوودەبین
ئامانجی کۆتایی لەم کارانەدا ئەوەیە کە ئێمە ڕۆحمان ئاسودەبکەین
نەك ئەوەی لە دوای کارەکە ، لە دوای یاریەکە ، خۆت دڵتەنگ بکەیتەوە و دەست بکەیت بە توڕەبوون
بۆیە دۆڕان یان بردنەوە گرنگ نیە، دەرچون یان کەوتن گرینگ نیە
بەڵکو ئەوە گرینگە کە تۆ دڵخۆش بیت
تۆ لەدوای کارەکە دڵت خۆش بێت نەك دڵتەنگ!

**داهاتوو پشت بەوە دەبەستێت،**
**کە ئێمە ئەمڕۆ چی دەکەین.    "غاندی"**

ئەمڕۆ.... هەمان ئەو "سبەینێ"یەیە ،
کە "دوێنێ" چاوەڕێی بووی!
دەی بزانە چیت کردووە تا ئێستا؟
ئایا ئەو تەمەنەی کە بەڕێیت کردووە ، لێی ڕازیت
گەر ئەمڕۆش ، وەکو دوێنێ پلان دانەنێیت
دڵنیابە "سبەینێشت وەك ئەمڕۆ دەبێت!

# رابردوو

هاورێ !

مەهێڵە ڕابردووە ڕەحمەتیەکەت

"ئێستا"ت بدزێـت !

مەهێڵە هەڵەکانی ڕابردووت

ببێتە هۆی ئەوەی "ئێستا" لەدەست بدەیت

مەهێڵە بیرکردنەوە لە ڕابردووت

ئێستات لە یاد بباتەوە

مەهێڵە ڕابردووت

ببێتە بەربەستێك بۆ سەرکەوتن لە ئێستادا

مە هێڵە ڕابردووە کۆچکردووەکەت

ببێتە هۆی ئەوەی ئاسوودەیی ئێستات لەبیربەرێتەوە !

هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت کە

"ڕابردوو" بوو بە "ڕابردوو" !

# ژیان

ژیان .... بریتییە لە شکستهێنان
بریتیە لە کەوتن .... لە دۆڕان
پڕە لە سەختیەکان ،
پڕە لە ناخۆشی و نەهامەتی
پڕە لە نارەحەتی و چەرمەسەری
پڕ پڕە !
بەڵام ئەوەش هەیە کە
بۆ هەموو سەختیەك کۆتاییەك هەیە
بۆ هەموو شکستێك
وانەیەك هەیە
بۆ هەموو کەوتنێك
هەستانەوەیەك هەیە
نازانم کەی کۆتاییەتی
وەلیٚ دڵنیام
کۆتاییەك هەر هەیە بۆ سەختیەکان

## بە ویستی خۆتە !

ژیان

بریتی نیە لە یاریەك بۆ شكستهێنان بە تۆ!

ژیان بریتی نیە لە فەرمانێك كە بە زۆر سەپێنرابێ بەسەر تۆدا

بەڵكو

ژیان بریتیە لە گۆڕەپانێك بۆ دروستكردنی كەسایەتی خۆت بە ویستی خۆت ،

نەك بە ویستی كەسانی تر

بریتیە لە هەلێك

بۆ پەرەپێدانی تواناكانی خۆت

بریتیە لە كێڵگەیەك

بۆ چاندن و دروێنەكردنی توانا ناوازەییەكانی خۆت

بۆیە هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت كە

بە ویستی خۆتە كە چۆن دروستی دەكەیت !

**ژیان بریتییە لە دۆزینەوەی خۆت**

**بریتیە لە**

**دروستكردنی خودی خۆت !**

## سەرکەوتن بڕیارە نەك حەز !

سەرکەوتن بریتی نیە لە حەز
سەرکەوتن شتێکی بۆماوەیی نیە کە لە باب و باپیرانەوە بۆمان بمێنێتەوە
بەڵکو
سەرکەوتن بڕیارە
بۆیە سەرکەوتن تەنها بۆ کەسانێکە کە
بڕیاریان داوە خەونەکانیان بکەنە ڕاستی !

## ئەحمەد زویل دەڵێ:

ڕۆژئاواییەکان زیرەك نین و ئێمەش گەمژە ... نا !
بەڵکو ئەوان پشگیری شکستخواردووەکەن تاوەکو سەردەکەوێت
ئێمەش دژایەتی سەرکەوتوو دەکەین تاوەکو شکست دێنێت ..!
ئەحمەد زویل – گەورە زانای کیمیا و خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ –

# بیگەشێنەوە !

هەر چەند فوو لە خەڵوز بکەین
گەر خۆی تروسکاییەکی تێدا نەبێت
ئەوا ناگەشێتەوە
ئێمەش بێگومان گەر تروسکاییەکمان تێدا نەبێت
هەرچەند فومان لیَ بکرێت
گەش نابینەوە !
لە تۆ دا .... لە هەر یەك لە ئێمەدا خەڵوزێك بونی هەیە
پشکۆ ئاگرێك لە ناو ناخی ئێمەدا بونی هەیە
دەی فوی لیَ بکە
بیگەشێنەوە
بیگەشێنەوە و ئاگرێکی بلێسەداری لیَ دروست بکە
کە هەم خۆت و هەم دەوروبەرت پێی گەرم ببنەوە !
بەم ئاگرە هەم دەتوانی رِێی خۆتی پیَ رِۆشن بکەیتەوە
هەم رِێگای خەڵکی
دەی رِەنگە ئەو ئاگرەی ناخت ئێستا کلّپەی نەبیَ
رِەنگە ئاگری ناخت کوژابێتەوە
وەلیَ شتێك هەیە

هەر چەندە ئاگری ناخت کوژابێتەوەش
بەڵام دڵنیام
خەڵوزێك هەر ماوە
بۆیە
فوی لیَ بکە
بیگەشێنەوە !
بیگەشێنەوە !

!

سەرکەوتن یەك (ڕێگا) نیە بە سەریدا بڕۆیت
بەڵکو چەندین ڕێگا هەیە بۆ سەرکەوتن.
بەڵام ڕێگاکانی شکست دیارن.
کەچی خەڵکی وەکو خوو و نەریتێك بەو ڕێگایانەدا دەڕۆن و
هەمان ئەنجامی خەڵکانی پێشوو بەدەست دەهێنن کە پێشتر بەو ڕێگایە
دا هاتوون،
کە ئەویش هەر شکستە رەحمەتیەکەیە !!

# چاوەڕێبوون

بەداخەوە

ئەم میللەتە توشی نەخۆشیەکی زۆر سەیر بووە، نەخۆشیەکی سەخت ، ئەویش چاوەڕێبوونە ،

نەخۆشی چاوەڕێبوون ، هەموومان چاوەڕێین!

چاوەڕێی چی ؟

هەموومان چاوەڕێین کەسێك بێت و لەو حاڵە ڕزگارمان بکات

هەموومان چاوەڕێین سەلاحەددینێکی تر بێت و قودسمان بۆ ڕزگار بکات !

هەموو مان چاوەڕێین (عومەری کوڕی خەتاب )ێکی ترین کە دادپەروەریمان بۆ بێنێتەوە !

هەموومان چاوەڕێین کەسێك بێت و دەستمان بگرێت و لەو قوڕە دەرمانبێنێت ، لەم تەنگانەیە ڕزگارمان کات !

بەلام کێشەکە ئەوەیە کە تەنها چاوەڕێین و بەس ... کەس نایەوێت خۆی ببێــە ئەو کەسە

کەس نایەوێت ئەو سەلاحەددینە کوری خۆی بێت ، کەس نایەوێت خۆی بێتە سەلاحەددین

کەس نایەوێت دادپەروەرانە ژیان بکا ... کەس نایەوێت کورەکەی وەك عومەرێکی دادپەروەر پەروەردە بکات!

کەس نایەوێت لەخۆیەوە دەست پێبکا

چاوەڕێیە بزانێ کۆتاییەکەی چیە

ئەزانی ئەوە وەکو چی وایە

ئەمە وەکو ئەوە وایە کە سەیری فیلم بکەیت

تۆ حەز ئەکەی بەتەڵ فیلمەکە لەکۆتاییدا ئاوا و ئاوا بکات

یان حەزدەکەی فیلمەکە بەو شێوەیە کۆتایی پێ بێت کە تۆ حەزی پێدەکەی!

واتە ئێمە وا سەیر ژیانی خۆمان دەکەین وەك ئەوەی سەیری فیلم دەکەین و چاوەڕێین بزانین فیلمەکە چۆن کۆتایی دێت !

بێ ئەوەی کارێك بکەین

بێ ئەوەی کاریگەری خۆمان بەدەر بخەین لە ژیانماندا

هەر چاوەڕێین و چاوەڕێین

# هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت

من کتۆر نیم

وەلیّ پێشنیاری ئەوەت بۆ دەکەم کە هەمیشە زەردەخەنە بکەیت، هەتا بۆ ئەو منالّانەش کە لە ناو گەڕەکەکەتاندا هەن

تا تێبگەیت کە هێشتا دەتوانین بیّ بەرامبەر خۆشەویستی بە ئەوانی تر ببەخشین

پێشنیاری ئەوەت بۆ ئەکەم کە هەمیشە بەرامبەر بە خەڵکی بخەندی

چونکە لە هەرجێیەکدا بیت

کەسێك هەیە کە چاوەڕێی خەندەکانی تۆیە

دەرونناس نیم

وەلیّ پێت دەڵێم کە هەمیشە شاد بیت

ڕۆژ

هەموو ڕۆژێك بەیانیەکەی

لەپێناو من و تۆ هەڵدێت !

هەر ئەمڕۆ دڵخۆشیت لە ژیاندا بەدەست بێنە ، هەر ئەمڕۆ

هەرگیز چاوەڕێی "بەیانی" مەبە!

هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت کە سەرکەوتن هەر ئەوە نیە کە دوای ساڵێك دوو ساڵ دە ساڵ بگەیت بە ئامانجەکەت.

بەڵکو، سەرکەوتن ئەوەیە کە لەزەت لەو ساتانە ببەین کە ئێستا تێیدا دەژین ، چیت داوە لە بەیانیەك کە نازانی کەی دێت !

کاتێک کەسێک ئەبینی کە زەردەخەنەی نیە
دانەیەک لەوەی خۆتی بدەرێ
" زیگ زیگلەر"

تۆ یەک زەردەخەنە بکە
پایز سەعاتێ دوائەکەوێ !
"شێرکۆ بێکەس"

کاتێ ژیان سەت هۆکار پیشانی تۆ دەدات بۆ دڵتەنگکردنت
ئەوا تۆ هەزار هۆکار بۆ پێکەنین پیشانی ئەو بدە ..!
"چارلی چاپلین"

**ژیان پێویستی بە دوو شت هەیە بۆ ئەوەی ئاسان بێت :**

**ئەویش ئارامگرتن و خەندەکردنە !**

**"احمد شوقەیری"**

**بە خەندەگەرمەکانت**

**کێشەکانی ژیان ، وەک بەفر بتوێنەوە !**

**هاوڕێ!**

**هەمیشە خەندەکانت**

**بەکار بهێنە بۆ گۆڕینی کێشەکانی ژیانت**

**وەلێ**

**هەرگیز ڕێگە مەدە**

**کە کێشەکانی ژیانت**

**خەندەی سەر لێوت بگۆڕن ..!**

**" شتێک کە لە ژیاندا گرینگە**

**ئەوە نیە کە لە واقیعدا کەسێکی بەهێز بیت**

**بەڵکو گرینگ ئەوەیە کە هەست بەبەهێزی بکەیت "**

# ڕێگەی مەحەبەت

لە هەر بارودۆخێکدایت

دڵتەنگ ،

بیَ تاقەت ،

دڵشکاو ،

ئاسوودە .....

بە ڕوویێکی خۆشەوە پێشوازی لە ژیان بکە ......

فێری زەردەخەنە ببە!

خەمەکانی جیهان بەکۆڵ خۆتەوە مەدە

مرۆۋ یەك جار ژیان دەکات ، دە مادام ژیان هەر ڕێگا ڕۆیشتن بیَ

وەرە با بە ڕێگای مەحەبەتدا تێپەڕین!"مەولانا مەحوی" وادەڵێت

# لە دەستی خۆتدایە

لەم دونیایەدا

هەموو شتێك لـە دەستی مرۆڤ دایە

ئەشق.. شێتی.. ترس ...

مرۆڤ هەتا دەتوانێت جولّە بە مەزنترن کێوەکان بکات گەر ویستی هەبێت

مرۆڤ چیرۆکێکە

دەتوانیّ هەموو جۆرە چیرۆکێك بێت

چیرۆکێکی شیرین

چیرۆکێکی تالّ

ناشیرین

یا چیرۆکێکی پالّەوانانە !

(سیمین دانشور)

لەدەستی خۆتدایە چ جۆرە چیرۆکێك دەبیت !

# سەختە ، وەلیٚ مەحاڵ نیە !

گۆرانی مرۆڤ سەختە و کەمێك ماندووکەرە
سەختە خویەك بگۆڕیت کە ماوەییێکی زۆر پێوەیەوە ڕاهاتوویت ، وەلیٚ مەحاڵ نیە !
سەختە کە ئەو یادگارییە تاڵانە لەبیربکەیت
کە هەموو ڕۆژێك وەکو زنجیر بەخەیاڵتدا دێن، وەلیٚ شتێکی مەحاڵ نیە!
بەڕاستی سەختە کە ئەو کەسانە ببوریت کە ڕۆژانێك تەنها خەریکی شکاندنی دڵی تۆ بوون و چێژیان لەو کارەیان دەبینی کە ئازارتت بدەن، وەلیٚ کارێکی مەحاڵ نیە کە لێیان ببوریت !
زۆر سەختە کە دوعا بۆ کەسانێك بکەیت کە ئازارت دەدەن و هەوڵدەدەن کە تۆ نەگەیت بە شوێنی خۆت ، وەلیٚ مەحاڵ نیە کە بەزەییت پێیاندا بێتەوە!
سەختە کە ئەو ڕەفتارانەی کە لەناو خەڵکی زۆر بڵاوە وازلێبێنی، وەکو : حەسوودی ، ڕق ، کینە ، تۆمەت ، غەیبەت ، درۆکردن ، خۆشنەویستن ،
وەلیٚ کارێکی مەحاڵ نیە !

# بخەندە !

هەمووومان کێشەمان هەیە

من هەمە ، تۆش هەتە

هەمووومان بەدبەختیمان هەیە ، گرفتاریمان هەیە ، ئەمە پەیوەندی بە شوێنی جوگرافیای مرۆڤەکانەوە نیە، بەڵکو هەموو کەسێك بەشی لە چەرمەسەری و سەختیەکانی ژیان هەیە

بیرت بیّ کە بخەندی .... بە کێشە و سەختیەکانی ڕۆژگار بخەندە

بە بەدبەخیەکان پێبکەنە

بە خۆت پێبکەنە

یەکەم جار سەختیەکان دوو ئەوەندە ئازاریان زیاترە

وەلیّ وردە وردە ڕادێیت و عادەتی دەکەیت

دواتر دەبینی کە پەیوەندی خەندە و سەختیەکان وەکو چەتر وایە

باران ڕاناگرێت

وەلیّ ناهێڵیّ تەڕ بیت

بەمشێوەیەش

خەندە ،

چارەسەری سەختیەکان ناکات ، بەڵکو کەمیان دەکاتەوە !

## مرۆڤەکان !

مرۆڤەکان
تەمەننای ئەوە دەکەن کە تۆ واز لە ڕەفتارە جوانەکانت بهێنی
تەمەننای ئەوە دەکەن ڕەفتارێکی جوان کە دەیکەی بێزاربی لێی!
مرۆڤەکان
تەمەننای ئەوە دەکەن کە چیدی ئیتر لەگەڵ هەستە جوانەکانت بجەنگی
تەمەننای ئەوە دەکەن کە لە فکرە جوانەکانت پەشیمان ببیتەوە !
مرۆڤەکان
تەمەننای ئەوە دەکەن کە خۆت ناچار بکەی بەدوای هەستە جوانەکانت نەڕۆی
تا ئەوەی ڕۆژێك بێ و هێندە لە هەستە جوانەکانت ناڕەحەتت ببی کە ئیتر وازیان لێ بهێنی
ئەو کات مرۆڤەکان دەڵێن:
برا ، بۆ ئاوات لێ هات ؟! ئەی ئەو هەست و فکرە قەشەنگانەت چی لێ هات .. !
مرۆڤەکان .......

سادە بژی

وەلێ

ژیان بە سادەیی بەڕێ مەکە

کە تەنها یەکجار

ئەزمونی دەکەیت !

# هەڵسەوە !

هەرکاتێ شکستت هێنا

خەڵکی تۆیان بە ئەرزدا دا

نەیانهێشت سەرکەوتوو بیت

تۆیان خستە خوارەوە

ئەوا تۆ هەڵسەوە

هەڵسانەوەیەکی چاوەڕواننەکراو

بەڵام بە شێوەیەکی باشتر، بەرزتر لە جاری پێشوو

وەك تۆپ وابە!

هەر چەند بەهێزتر بە ئەرزیاندا دای

زیاتر و زیاتر بەرزبەوە !

# خەڵکی

تۆ کاتێکی زۆر لەگەڵ خەڵکی بەسەر دەبەیت

تۆ کاتێکی زۆر خەرج دەکەیت بۆ ئەوەی کە خەڵکی تۆیان خۆش بوێت

تۆ زیاتر خەڵکی دەناسی لەوەی کە خۆت دەناسی !

تۆ لە خەڵکی  ورد دەبیتەوە

لەبارەی ئەوانەوە شتی زۆر دەزانیت

تۆ دەتەوێت وەك ئەوان گفتوگۆ بکەیت وەکو ئەوان جل لەبەر بکەیت

دەتەوێت تەواو وەکو ئەوان بیت

هەموو تەمەنت لەسەر وردبونەوەی خەڵکی بەفیڕۆ دا،

لەکاتێکدا نازانی کە خودی خۆت کێی !

مەبە بە باشترین کۆپی خەڵکی ، بەڵکو ببە بە باشترین شتێك کە دەتەوێت ببی

ئەوە گرینگە کە کاتێکی زۆر لەگەڵ خودی خۆتدا بەسەر بەریت

ئیتر کاتی ئەوەیە کە لە خۆت ورد ببیتەوە

گەر دەتەوێت خۆت بناسیت ..... دەبێ تەنیا بیت

دەبێ چەند کاتژمێرێك لەگەڵ خۆتدا بەسەر بەریت بۆ ناسینی خودی خۆت

## بیری خەڵکی

د.دانیال ئامەن دەڵێ:

"لە هەژدەساڵی، نیگەرانی ئەوەین کە خەڵکی چۆن بیر لە ئێمە دەکەنەوە، وەختێ دەبیت بە چڵ ساڵی ، هیچ گرینگی بەوە نادەن کە خەڵی چۆن بیر لە ئێوە دەکەنەوە، وە کاتێ بووی بە شەست ساڵی ، ئەوجا پەی بەوە دەبەیت کە ئەسڵەن هیچ کەس بیر لە تۆ ناکاتەوە !! "

وای کە چۆن تەمەنی خۆمان بەفیڕۆدەدەین بۆ ئەوەی کە خەڵکی رازی بکەین و خەڵکی ئاوا بیر لە ئێمە نەکەنەوە، هەموو تەمەنمان بۆ ئەوەیە کە خەڵکی ڕازیبکەین کە چۆن بیر لە ئێمە دەکەنەوە

ژیانی خۆمان بەهەدەردەدەین لەبەر بیرکردنەوە و ڕازیبونی خەڵکی

## خەمخواردن حەرامە !

هەروەك چۆن خواردنی شەراب حەرامە

بەهەمان شێوەش خەم خواردن حەرامە

وە هیچ شتێك هێندەی خواردنی خەم حەرام نیە !

گەر ئێمە بزانین کە دونیا دونیای ئەوە

ئیتر بۆچی دەبێ خەم بخۆین ؟!

"دوکتور الهی قمشه های" وا دەڵێ

## سەختە

دەزانم هاوڕێ

سەختە .... ئاسان نیە کە ژیانی خۆت بگۆڕیت

لەکاتی کارکردن بۆ خەونەکەت توشی بێهیواییەکی زۆر دەبیت

توشی شکستێکی زۆر دەبیت ، توشی ئازارێکی زۆر دەبیت

توشی حاڵەتێکی وا دەبیت کە تەنانەت شك لە خۆت دەکەیت

باشە بۆ ؟ بۆچی ئەمە دەبێ بەسەر مندا بێت؟ بۆچی ؟

من تەنها هەوڵمداوە کە کار بکەم بۆ ئامانجەکەم ، بۆچی توشی ئەم سەختیانە دەبم ؟بەڵام ئەوە بزانە کە سەختیەکان شتێکی کاتین

سەختیەکان بۆ ئەوە نایەن کە بمێننەوە، بەڵکو بۆ ئەوە دێن کە تۆ بەسەر ئەواندا تێبپەڕیت، وە لەوە دڵنیابە کە گەورەیی و سەرکەوتن

تەنها بۆ چەند کەسێکی دیاریکراو نیە کە تەنها ئەوان دەتوانن بیچێژن

تەنها بۆ چەند کەسێکی لێهاتوو نیە کە تەنها ئەوان بتوانن کە سەرکەوتوو بن

بەڵکو

سەرکەوتن بەتەواوەتی لەناو ناخی هەر یەکێك لە ئێمەدا بونی هەیە

بۆیە ئەوە زۆر گرینگە کە تۆ باوەڕی تەواوت بەوە هەبێت کە تۆ ئەو کەسەیت کە دەتوانیت ببیت !

## تەنها بڕیار بدە

شتێك هەیە هەرچەندە كە دەشیزانی !
ئەویش ئەوەیە كە ژیان هەمووی كۆلكە زێڕینە نیە
هەمووی درەوشانەوە و سەركەوتن نیە
بەڵكو ژیان شوێنێكی سەختە، توشی ئازار دەبی
تۆ.. من .. هەر كەسێكی تر دەبێ توشی سەختیەكان بیێ وەكو چۆن
ژیان هەر ئاوەهایە
بەڵام بابەتەكە ئەوە نیە كە چەندە سەخت توشی سەختیەكانی ڕۆژگار
دەبی
بەڵكو بابەتەكە ئەوەیە كە چەندە بەرگەی سەختیەكان دەگریت و
بەردەوام دەبیت لەسەر ڕێگاكەت
سەختیەكان هەر چەندێك بن، دەقەیەك، سەعاتێك، ساڵێك، یان هەموو
ژیانتان ناخۆشی بێت
بەڵام لە كۆتاییدا ناخۆشی و سەختیەكان هەر كۆتایی دێن و نامێنن
بۆیە گەر خەونێكت هەیە
دەبێ پارێزگاری لێبكەیت
خەڵكی گەر كارێكیان پێنەكرێت ، ئەوا بەتۆش دەڵێن كە ناتوانی ئەو
كارە بكەیت

بەڵام تۆ گوێیان پێ مەدە

گەر شتێکت ویست

بڕۆ بەدەستی بێنە

ئەوە گرینگ نیە کە خەڵکی چەندە ئەو کارەی تۆ بە شێتانە دەزانن

تەنها بڕیار بدە ، هەڵبژێرە

پرسیار لەخۆت بکە

دەتەوێت پێی بە چی ؟ دەتەوێت پێی بە کێ؟ چۆن ئەو کارە دەکەیت؟

تەنها بڕیاربدە!

تۆ هەمیشە هەوڵبدە لەو شتەی کە ئێستا هەیت بۆ ئەو شتەی کە

دەتەوێت ببیت

گرینگ نیە کە چەندە سەختە یا چەندە ئازارهێنەرە

بڕۆ بەدەستی بێنە

بڕۆ پیشانی جیهانی بدە کە تۆ چەندە ناوازەیت .....

## چارەنوست بەدەست خۆتە

زۆرێك لە خەڵكی خوێندن تەواودەكەن و خێزان پێكدەهێنن و بژێوی ژیان دابین دەكەن و پاشان دەمرن

ئەوان چیتر پەرە بە خۆیان نادەن

چیتر گەشە بە تواناكانی خۆیان نادەن

وە زۆرێك لە خەڵكی گلەیی لەدەست ئەو بارودۆخە دەكەن كە تێیدان ، بەڵام هیچ ناكەن بۆ ئەوەی ئەو بارودۆخەیان بگۆرن، تەنها سەیری ژیانی خۆیان دەكەن ، وەكو ئەوەی سەیری فیلم بكەن

گەر فیلمەكە خۆش بوو پێدەكەنن و گەریش ناخۆش بوو بێتاقەت دەبن بەهەمان شێوەش ئاوا سەیری ژیانی خۆیان دەكەن

گەر شوێنێكی ژیانیان خۆش بوو دڵخۆش دەبن و گەر لایەكیشی سەخت و ناخۆش بوو ئیتر ئاه هەڵدەكێشن و هەر ئەوەندە

بەبێ ئەوەی هەوڵدەن كە ژیانیان بگۆرن ، بەبێ ئەوەی كە سەختیەكان لابەرن

بەبێ ئەوەی كە كارێك بكەن بۆئەوەی كە بارودۆخەكان بەو پێیە بەرن كە ئەوان دەیانەوێت....

لەوەتەی مێژوو هەیە مێشە هەنگ هەر هەنگوین دروستدەكات ، وە بە سەدانساڵیتریش بڕوات هەر هەنگوین دروست دەكات و هەر ئەوە كاری دەبێت ، چونكە ئەوە ڕێڕەوی ژیانیەتی و ئەوە كاریەتی

بە هەمان شێوە مەڕ هەر مەڕە و هەر مەڕیش دەبێت و شێر بەهەم دەهێنێت هەرگیز کارێکی تر ناکات

بەڵام مرۆڤ وانیە

مرۆڤ دەتوانێت ببێت بە هەر شتێك کە دەیەوێت

مرۆڤەکان وادەزانن کە ژیانیان لە سەرەتاوە نوسراوەتەوە و بڕاوەتەوە و هەر دەبێ ئەوە ڕوبدا کە نوسراوە

لە کاتێکدا جیاوازی مرۆڤ لەگەڵ تەواوی کائیناتەکانی تردا ئەوەیە کە خۆی ڕێڕەوی ژیانی خۆی دیاریدەکات ، خۆی دەنوسێت کە چی چارەنوسی دەبێت

خۆی ئەوە دیاریدەکات کە دەیەوێت ببێت

ئەوە مرۆڤە کە دەتوانێت ببێت بە نیوتن و ئەنشتاین و گالیلۆ

هەر مرۆڤە کە دەتوانێــت ببێت بە سوقرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ و غەزالی

هەر مرۆڤە کە دەتوانێــت ببێت بە بتهۆڤن و داڤینچی و ڤان کوخ

هەر مرۆڤە کە مەحوی و نالی و مەولانا و دانتی و گۆتەی لێ دروست دەبێت

وە هەر مرۆڤیشە کە هیتلەر و سەددام و مۆسۆلۆنی و دیکتاتۆریشی لێ دەردەچێت !

به کورتی مرۆڤه بڕیار دەدات لەو شتەی کە هەیە بۆ ئەو شتەی کە دەیەوێت ببێت

دەی چارەنوسی خۆتە و بینوسەوە.....

## تۆ مەگۆڕێ

لێگەڕێ با خەڵك هەر پێت بڵێن کەسێکی سادەیە

با هەر پێت بڵێن فەرامۆشکاری

لێگەڕێ با هەر پێت بڵێن کە زوو دەبەخشی

ساڵەهایە کە کەسێکی سادە لەسەر ئەم زەویە بونی نییە

لێ گەڕێ ئەوان هەر گلەییت لێ بکەن کە کەسێکی زۆر سادەی

وەلێ تۆ مەگۆڕێ

تۆ خۆت بەو پیشانی بدە کە مرۆڤایەتی هێشتا هەناسە دەدات

میهرەبان بە و هەمیشە میهرەبان بمێنەوە!

## بێ بونی تۆ ڕەنگە ...

شادی ئەوەیە کە مرۆڤ جۆرێ ژیان بکات کە بە هاتنی بۆ ژیان شتێکی جوان پێشکەش بکات و بە ڕۆیشتنیشی هەست بە جێگا خاڵیەکەی بکرێت

مرۆڤ لەو ژیانەدا دەبێ جێ پێی بهێنێتەوە

ئێمەی مرۆڤ نەهاتووین بۆ ئەوەی شت لە یەکتری وەربگرین

بەڵکو بۆ ئەوە هاتووین کە بە یەکتری ببەخشین

هاتووین بۆ ئەوەی کە

ئەشق

بڕوا

جوانی، بە یەکتری ببەخشین

هاتووین جێگا خاڵیەکان پڕبکەینەوە کە تەنها بە ئێمە پڕ دەکرێنەوە

بەبێ بونی تۆ

ڕەنگە شوێنێك خاڵی بهێنێتەوە

دڵێك بێ نەوا بێ

لێوێك بێ خەندە سەربنێتەوە

## بۆ ئەوە نیە کە لەناو دڵتا هەڵی بگری

ئەشق بۆ ئەوە نیە کە لەناو دڵتا هەڵی بگری

ئەشقێك کە بڵاو نەکرێتەوە و نەدرێ بە کەسانی تر

ئیتر ئەوە ئەشق نیە .. ! "شەیکسپیر"

هیچ شتێك لە سروشتدا کە هەیە، لە پێناو خۆی ژیان ناکا

ڕووبارەکان ئاو لەپێناو خۆیاندا ناگوێزنەوە

درەختەکان میوەکانی خۆیان ناخۆن

ڕۆژ سوود لە گەرمیەکەی خۆی وەرناگرێت

ئیتر ئەوەیە یاسای ئێرە

ژیان کردن لە پێناو کەسانی تردا!

## ئێستا شاد ترم !

ئێستا بەهێزترم

بەهۆی ئەو سەختیانەی کە بەسەریاندا تێپەڕیم ...

هۆشیارترم

بەهۆی ئەو هەڵانەی کە لە پێشتردا کردومن ....

شاد ترم

بەهۆی ئەو ئەزمونە تاڵانەی کە کردوومن !

# ناوی مەنێ ژیان!

ئێمە هەر ڕۆژێکمان دووبارەی دوێنێ یە!
هەر مانگێکمان دووبارەی مانگی ڕابردووە!
هەر ساڵێکیشمان دووبارەی هەمان ساڵانی ڕابردووە!
جا کە کابرا بوو بە 70 ساڵ
دەڵێ: خەڵکینە 70 ساڵ ژیام
ئاخر ژیانی چی ؟
ژیان هەرکاتێك بوو بە دوبارەکردنەوەی دوێنێ
ئەوە مانای خۆی لەدەست دەدات
گەر 70 ساڵ ژیایت و ئەو ساڵانەت تەنها دووبارەکردنەوەی ڕۆژەکان بوو
ناوی مەنێ ژیان!

# ژیان بریتیە لە ئەشق و ئومێد !

ژیان بریتی نیە لە دوێنێ
بەڵکو ژیان بریتیە لە ئەمڕۆ
چیرۆکی ژیان بریتیە لە ئەشق و ئومێد
نەك شانۆی پێشکەشکردنی غەمەکان
ژیان بریتیە لە ئێستا
بریتیە لە ئێرە !
ئەشق لێرەیە و تۆش لێرەیت و خوداش هەر لێرەیە
دەی بیرت بە چیەوە مژۆڵە ؟
بۆچی نیگەرانی ؟
نیگەرانی کارێکی بێجایە
پێیەکانت ڕەها بکە
ڕێگاکان چاوەڕێی تۆ دەکەن
تاوەکو تۆ بەهەر شوێنێك کە بتەوێ بڕۆیت
دەی رەها بە
تاوەکو لە قەفەسدا نەمێنیتەوە

## شادی

موهیم ترین شت چیە لەو دونیایەدا؟

تەنها یەکشت موهیمە لەو دونیایەدا

ئەویش ...

شادییە!

هەرگیز ڕێگە مەدە کە کەسیّ

ڕێگربیّ لەبەردەم شاد بونی تۆدا.

## ئەوە گرینگە کە تۆ کێی

ئینسانیەت بون و ڕەفتاری خۆت پەیوەست مەکە بە کەسانی ترەوە

خراپی خۆت پەیوەست مەکە بە خراپی کەسەکانەوە

هەمیشە خۆت بە و بەبیّ ئەوەی سەیری ئەوە بکەیت کە بەرامبەرت

چیە و کێیە بەڵکو ئەوە گرینگە کە تۆ کێی .. کەسیّ بە گوڵی گوت:

تۆ یەك کێشەت هەیە ، ئەویش ئەوەیە کە لەگەڵ هەر کەس دابنیشی،

بۆنی خۆتی پیّ دەدەی.

گوڵیش گوتی : ئاخر ئەوە گرینگ نیە کە لەگەڵ کێم ،

بەڵکو ئەوە گرینگە کە من کێم !

# لەبیری دروستکردنیان دابە

هەموو بە ئێوە دەڵێن
"بەو هیوایەین کە ژیانێکی خۆش بەسەر بەریت"
وەلێ ئێمە بە ئێوە دەڵێین:
"بەو هیوایەین کە ژیانێکی خۆش بۆ خۆتان دروست بکەن!"
لە بیری ڕۆژە خۆشەکانەوە مەبە ... ئەوان هەرگیز نایەن..!
بەڵکو لەبیری دروستکردنیاندا بە
ڕۆژە خۆشەکان دەبێ دروست بکرێن!

## لە ترسی کێ!

تۆ زۆربەی کات

نا نا .. بەڵکو هەمیشە دەترسی لەوەی کە ئەو شتە بکەی کە دەتەوێت

لە خەڵك دەترسی

لە دەورووبەر دەترسی

لە هاورێکانت دەترسی

بەڵام بزانە .. لە سەدا 90٪ ی خەڵکی و هاورێ و دەورووبەرت هیچ لایان گرینگ نیە کە تۆ چی دەکەیت و چچی ناکەیت و بیر لە چی دەکەیتەوە و بیر لە چی ناکەیتەوە

وە لە سەدا 10٪یەکەی تری، هەمیشە پێیان ناخۆشە کە تۆ بە سەرکەوتوویی ببینن، دڵیان سوکنایی دێت کە تۆ بە پەشۆکاوی و بێتاقەت و ماندوویی دەبینن

دڵیان ئاو دەخواتەوە کە تۆ بە شکستخواردویوبی دەبینن

دڵیان دەتەقێت و شەوانە خەو ناچێتە چاوەکانیانەوە گەر تۆ شتێك بکەیت و سەرکەوتوو بیت تیایدا، دائیما ڕەخنە و تەعلیق دەگرنە تۆ

دەی باش بزانە کە تۆ لە کێ دەترسیت و لە ترسی کێ هەنگاو نانێیت!

خەڵك پێی وایە کە تۆ هیچ نیت

ڕەنگە تۆ هەر بونت نەبێ لای ئەوان
گەر کارێك بکەیت یان شتێکت بکەوێتە دەست
ئەوان ڕەخنەت لێدەگرن و بە کەسێکی بێسوود ناوت دەبەن
پێت دەڵێن کە تۆ ناتوانی ئەو کارە بکەیت، ناتوانی سەرکەوتوو بیت
دائیما دەتشکێننەوە تۆ بە منداڵێکی بچوکی نەزان دەبینن

تۆ
وەرە بیسەلمێنە کە وا نیت
بیسەلمێنە کە ئەوان هەڵەن
بیسەلمێنە کە تۆ کەسێکی دەتوانی ئەو شتە بکەیت کە دەتەوێت
بۆ ئەوان نا
بۆ ئەوانی مەسەلمێنە
بەڵکو بۆ خۆتی بسەلــمێنە
بە خۆتی بسەلمێنە کە تۆ چیت و کێیت...

تۆ لە ژیانتدا زۆرێك لەو شتانەت نەکردووە کە دەبوایە کردباتن
زۆرێك لەو کارانەت نەکردووە کە دەبوایە بتکردبان

زۆرێك لەو بڕیارانەت نەداون كە دەبوایە بڕیارت دابوایە بیانكەیت
زۆرێك لەو كارانە كە بڕیارت دابوو بیانكەیت، نەكردن و پەشیمانبویتەوە
بۆچی؟
چونكە تۆ ترسایت
ترسایت لە قسەی خەڵكی
ترسایت لە شكست هێنان
ترسایت لەوەی كە بكەویت و خەڵك گاڵتەت پێ بكەن
بۆیە ترسایت چونكە وات بیردەكردەوە كە تۆ كەسێكی كامڵ نیت
پێتوایە كە دەبێ كامڵ بیت ئینجا دەبێ شتەكان بكەیت
بەڵام ئەوە بزانە
پێویست ناكات كە كامڵ بیت
پێویست ناكات كە لە هەموو شتێكدا پێرفێكت بیت بۆ ئەوەی ببیت بەو شتەیكە دەتەوێت
پێویست ناكات كە پێرفێكت بیت بۆ ئەوەی ئەو شتە بكەیت كە دەتەوێت
درۆیە، شتی پێرفێكت و كامڵ بونی نیە
مەوەستە

لە ژیاندا شتی پێرفێکت و کامڵ و کاتی تەواو تەواو گونجاو بونی نیە
بۆ ئەوەی کە بڕیار بدەیت و ڕێڕەوی ژیانتی پێ بگۆڕیت
گەر تۆ چاوەڕێی ئەو کاتە دەکەیت، گەر چاوەڕێی کاتی تەواو تەواو
گونجاو دەکەیت بۆ ئەوەی بڕیار بدەیت
چیتر نەیکە، چیتر چاوەڕێ مەکە
تۆ نابێ چاوەڕێی کاتی گونجاو بکەیت
کاتی گونجاو هەرگیز نایەتە لای تۆ
چونکە کاتی تەواو تەواو گونجاو بونی نیە
تۆ دەبێ کاتی گونجاو و هەلی گونجاو
بخولقێنیت!

# چاوەڕێی چی دەکەیت؟

چاوەڕێی کێ دەکەیت؟

چاوەڕێی چ شتێك دەکەیت؟

واز لە چاوەڕوانی بێنە ئیتر

دەست پێکە بەو شتەی کە لە مێشکتدایە

مەهێڵە ئەو شتانەی لە دەورروبەرتە

ئەو سنوورانەی کە دەوری تیانداوە ، بتوەستێنن

مەهێڵە کۆمەڵگاکەت

ترسەکانت

ماڵەوەت

شارەکەت

هاوڕێکانت

ببنە بەربەست لەبەردەم ئەو شتەی کە تۆ ئاسوودە دەکات

بڕۆ ئەو شتە بکە کە خۆت دەتەوێت

وەرە بیسەلــمێنە کە تۆش یەکێکیت لەوانەی کە بەو شێوەیە دەژیت

کە خۆت دەتەوێت

بیسەلمێنە کە تۆش خەونێکت هەیە و بۆی هەوڵ دەدەیت

# کێشەکە چییە؟!

کێشە ئەوە نیە

کێشە ئەوە نیە کە شکست نەهێنێت

هەتا برۆ ژیانی تەواوی ئەو کەسانە بخوێنەوە کە لەناو خەڵکی بە سەرکەوتوو ناسراون، دەبینی کە شکستخواردووترین کەسەکان بوون و یەك دوو جار سەرکەوتوو بوون دەنا هەموو ژیانیان لە شکستدا بووە، بەڵام بەردەوام هەوڵیانداوە و شتی نوێیان تاقیکردووەتەوە و سەیری ڕابردوویان نەکردووە.

کێشە ئەوەیە مرۆڤ خەونێکی نەبێت

شتێکی لە مێشکیدا نەبێت

# قوتوی ڕەنگەکان

خوا ژیانی تۆی ئافراند

وەلێ ژیانی تۆی ڕەنگ نەکرد

بەڵام قوتووی ڕەنگەکانی دایە دەستی تۆ

چونکە بەدەست خۆتە کە چۆن ژیانت ڕەنگاوڕەنگ دەکەیت

دەی ژیانت بنەخشێنە

ژیانی ئێوە بەدەستی خۆتانە

زۆرێك لە خەڵکی باوەڕ بەوەناکەن

یان بە تاوانی دەزانن کە ژیانی خۆیانیان بنەخشێنن!

یان ئەوەتا هیچ خەونێکیان نیە و بەردەوام لە چاوەڕێی ئەوەدان کەسێك دەستیان بگرێ، یان دەترسن و نازانن ۆن ڕووبەڕووی ئەو دونیایەی کە لەپێشیانە بوەستن.

## مەرج نیە گوڵەکە ناشیرین بێت!

دڵتەنگ مەبە کاتێك کە خەڵکی تۆیان بە دڵ نەبوو
دڵتەنگ مەبە کاتێك کە خەڵکی بە خراپ وەسفیان کردی
هەر چەندە تۆ کەسێکی باش و میهرەبان بیت لەگەڵیان
بەڵام ئەوان هەمیشە دڵڕەقن لەگەڵ تۆدا
مەرج نیە کە ئەوان تۆیان پێ ناشیرین بوو
مانای ئەوە بێــت
کە تۆ کەسێکی جوان نیت
ڕۆژێك کەسێك بەسەر گوڵێکەوە هاواری کرد و
بە ناشیرین وەسفی کرد
ئەوە بەهۆی ناشیرینی گوڵەکەوە نەبوو
بەڵکو بەهۆی بەدبینی مرۆڤەکەوەبوو کە جوانی نابینێت
لە کۆمەڵگادا، کەسانێکی زۆر هەن کە جوانیەکان نابینن
وەکو مێش ، تەنها لە شتە ناشیرنەکان نزیکدەبنەوە
وەکو کوێر ..
شوشە و مرواری وەك یەك ببینن
بۆیە دڵتەنگ مەبە

## ئێمە بە هەڵە لە ژیان گەیشتووین !

ئێمە بە هەڵە لە ژیان گەیشتووین !

چونکە بۆ ئەوەی خۆشحاڵبین

بۆ ئەوەی دڵخۆش بین، بۆ ئەوەی ئاسوودەبین

هەمیشە چاوەڕێی ئەوەی دەکەین کە شتێك ڕوبدات

ئینجا دڵخۆش بین

هەمیشە چاوەڕێی ئەوەین کە کارێك ڕووبدات

بۆ ئەوەی دڵمان خۆش بێت

هەمیشە چاوەڕێی هۆکارێکین بۆ ئەوەی ئاسودەبین

وەلێ تۆ چاوەڕێی هۆکارێك مەکە بۆ دڵخۆش بوون

چاوەڕێی ئەوەی مەبە، کە کەسێك دیاریەکت بۆ بێنێ

ئینجا دڵخۆش بیت!

تۆ چاوەڕێی ئەوەی مەبە کە دەرچویت لە تاقیکردنەوەکان

ئینجا دڵخۆش بیت!

چاوەڕێی ئەوەی مەبە کە ڕۆژی لەدایك بونت هات

ئینجا دڵخۆش بیت!

تەنانەت تۆ دەتوانیت هەر ئێستا بڕیاربدەیت کە خۆشحاڵ بیت

چاوەڕێی هیچ کەسێك و هیچ شتێك مەکە بۆ بەختەوەری

بەختەوەری و دڵخۆشی خۆت
پەیوەست مەکە بە هیچ شتێکەوە!
بە هیچ کەسێکەوە
بە هیچ بارودۆخێکەوە

## بەڵێ ئێمە بە هەڵە لە ژیان گەیشتووین !

ئێمە بە هەڵە لە ژیان گەیشتووین
چونکە وا دەزانین کە ژیانمان لەسەرەتاوە نوسراوەتەوە و
هەرچی نوسراوە دەبێ ئەوە بێ
بەڵام لە کاتێکدا وا نیە !
تۆ خۆت بڕیاردەدەیت کە دەتەوێت ببیت بە چی
ئەوە خۆتی کە ژیانی خۆت دەنوسیتەوە
بەڵێ ، بەڵێ ..
تۆ نوسەری ژیانی خۆتی نەك کەسێکی تر
خوای گەورە چارەنوسی هەموو شتەکانی دیاریکرد
وەلێ چارەنوسی ژیانی تۆی نەنوسی
چونکە بۆ تۆ لێی گەڕا
خوای گەورە ژیانی تۆی ئافراند
وەلێ ژیانی تۆی ڕەنگ نەکرد
بەڵکو قوتوی ڕەنگەکانی دایە دەستی تۆ
چونکە ئەوە تۆیت
کە بڕیاردەدەیت کە چۆن ژیانت ڕەنگاوڕەنگ بکەیت

بۆ ئەوەی تۆ خۆت بڕیاربدەیت کە ببیت بەو شتەی کە خۆت دەتەوێت!

دەی هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت کە

ژیانی تۆ نەنوسراوەتەوە، بەڵکو تۆ دەینوسیتەوە

ژیانی تۆ تابلۆیەکە ، فڵچەی ڕەنگەکانی بەدەست خۆتەوەیە

ژیانی تۆ کتێبێکە

قەڵەمەکەی لەناو پەنجەکانی تۆ دایە

تۆ نوسەری ژیانی خۆتیت

دەی بینوسەوە .... بینەخشێنە

بیکە بەو نیگارەی کە لە خەیاڵتادایە

بینوسەوە بەو شێوەیەی کە تۆ دەتەوێت

نەك بەو شێوەیەی کە کەسانی تر دەیانەوێت !

((گەر تا ئێستاش بە دوای کەسێکدا دەگەڕێیت
کە ژیانی تۆ بگۆڕێت،
ئەوا بڕۆ سەیری ئاوێنە بکە ! ))

## وتەی کۆتایی

کتێبەکە (کۆتایی) هات

وەلیّ بەو هیوایەی (کۆتایی) ئەم کتێبە ،

ببێــە (سەرەتایەك)

بۆ بنیاتنانی ژیانێکی نویّ

(کۆتایی) ئەم کتێبە ،

ببێتە (سەرەتایەك) بۆ گۆڕانکاری لە ژیاندا

ببێتە (سەرەتایەك) بۆ سەیرکردن لە ژیان بە شێوەیەکی جیاوازتر ...

ببێتە (سەرەتایەك) بۆ دەستپێکی سەرکەوتنەکان ....

ببێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی

کە ئێمە (هەستمان) بە ناوازەیی ناخی خۆمان کردبێت .

هەستمان بەوە کردبێــت کە چەندە ناوازەین

پەیمان بە ناخی خۆمان بردبێت کە چەندە فراوانە

ئێستا کۆتا وتەم ئەوە دەبێت کە بە تۆ بڵێم :

لـــەبـــیـــرت بـــیّ

تۆ زۆر ناوازەیت !